# پێرست

مەراق لە تەونی جاڵجاڵۆکە دەچێ. منیش بوومەتە جاڵجاڵۆکەیەکی زەبەلاح و ناوەوە و دەرەوەی خۆم لە مەراقا تەونپێچ کردووە. کەسیش نیە بە هانامەوە بێت و لەو تەلیسمە نەفرەتیە رزگارم بکات. یان هیچ نەبێت درزێکم لەو دیوارە تەونەوە بۆ بکاتەوە و پەلکێشی دەرێم بکات. دایکم هەمیشە دەیگوت " کوڕم نەکەی مەراق بتگرێ. دەتەلفێی ها".. ئەوسا نەمدەزانی مەبەستی لە "دەتەلەفێی" چیە و ئەگەر مەراق لە شتێک بگرم چیم بەسەر دێ. ئەقڵیشم بەوەدا نەدەشکا لە کەسێک بپرسم یان لەنێو لاپەڕەکانی

فەرهەنگنامەکاندا بگەڕێم بزانم " دەتەلەفێی" چیە.
هەر ئەوەندەم لە مەبەستی هۆشدارکردنەوەکەی دایکمدا هەڵدەکڕاند، کە ئەگەر مەراق لە شتێکا بگرم بەڵایەکم بە سەردێ. بەڵایەکەش لە گەورەییا لە کارەسات دەچێ. کارەساتێک کە ئەگەر هاتو قەوما ئیدی رێگای گەڕانەوە بۆ دواوەم لێ دەگرێ و هیچ پەشیمانبوونەوەیەکیش دادم نادا. کاتێ ناو کاسەی زەینم دەشلەقێنم وەکو گرتە کۆنەکانی فیلمە رەش و سپییەکان هەندێ دیمەنی پچڕ پچڕم دێتەوە بیر. تا بۆم بکرێ چاوەکانم زەق دەکەمەوە و گوێچکەکانم زیت دەکەمەوە و لە ناو ئەرشیفە تۆزگرتووەکەی زەینمدا بەدوای تەفسیرێک بۆ " دەتەلەفێی" دەگەڕێم. دەکرێ گەڕان بەدوای ئەو وشە کارەساتاوییە هەر خۆی لێم بوویێتە مەراقێکی کوشندە و خەریکە رێگە بە هاتوچۆی هەناسەم دەگرێ و زۆرجار لەدوا قۆناغەکانی خنکان، کەلەبەرێک بۆ هاتوچۆی هەناسەم دەکرێتەوە و رزگار دەبم.

دایکم بە رەش و سپییەکی تەڵخ و شێلوو دەبینم

له گۆشه تاریکه‌که‌ی ژووره دووکه‌ڵگرتووه‌که‌یدا خۆی له ترسی ئه‌و هه‌زاران ترسه‌ی له‌گه‌ڵی له دایکبوون گرمۆڵه کردووه و روو له یه‌کێک _ دیاره له منه_ ده‌ڵێت : " مه‌راق وه‌کو تریاک وایه". ئینجا ده‌کوژێته‌وه و ده‌مخاته نێو پرسیارێکی دیکه‌ی بێ وه‌ڵام. ئه‌ی ده‌بێ تریاک چی بێ؟ ئه‌مجاره‌یان به‌هه‌موو ئه‌و هێزه سسته‌ی تێمدا هه‌بوو، سه‌رم ده‌کێشا به دیواره گڵێنه‌که‌دا، تا ناو کاسه‌ی زه‌ینم بشله‌قێ و له‌نێو په‌رتوکخانه‌ی مێشکمدا شتێکم ده‌سگیر بێ. کاتێ هه‌موو پیت و وشه و چه‌مک و واژه‌کان ده‌نیشنه‌وه، هه‌ر ته‌نها شتێکی له شێوه‌ی پاتریاک له نێو زه‌ینمدا، ده‌مایه‌وه که دوور و نزیک پێم نه‌ده‌به‌سترایه‌وه به تریاکه‌وه. ریزه ددانه کرمێبووه‌کانم به‌سه‌ریه‌کدا ده‌قه‌ڕساند و هاواری دایکمم ده‌کرد. نه‌مده‌ویست که‌س گوێی له هاوارم بێت. بۆیه ده‌نگی هاوارکردنه‌که‌م تا زه‌مه‌نێکی درێژ له‌نێو کاسه‌ی سه‌رمدا ده‌سووڕایه‌وه و ده‌نگی ده‌دایه‌وه. ده‌تگوت سه‌رم بۆته ده‌هۆڵێک و ده‌هۆڵچییه‌کی ماندوونه‌ناس هه‌ڵپه‌رکێیه‌کی

ڕەشبەڵەکی پێ جۆش داوە. نا، تازە مەراق گرتبوومی. ئیدی گۆشت بە ئێسقانەکانی جەستەمەوە نەمابوو. هێندەی هەوڵمدا گرتە کۆنەکانی دایکم بە ڕەش و سپێتی بگەڕێنمەوە سەر شاشەی زەینم بێ سوود بوو. تا شەوێک هاتە خەونم، سپێتییەکەشی پێوە نەمابوو. تەنها سێبەرێکی ڕەش بوو. لە تارماییەکی ماندوو دەچوو کەس توانای بینینی نەبێ بێجگە لە من. ڕەنگە ئەگەر هەر لە بێداریدا بوایە نەمدیتبا، بەڵام لە خەوما دەیمبینی. دەمزانی ئەوە دایکمە. زەمەنێکی زۆر تێمڕاما. ترسام. ویستم بقیژێنم. بەڵام لەوە ترسام واگابێم و دایکمم لەدەست بچێتەوە. بۆیە ترسەکەمم قوت دایەوە. زەمەنێکی یەکجار درێژ تێمڕاما. من میلە بچووکەکانی کاتژمێرێکی گەورەو زەبەلاحم دەبینی بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر سەریان نابووە دوای یەک و دەسووڕانەوە. ڕۆژەکانی هەفتەم دەبینی وەکو گەڵای پاییز بەسەر دارێکەوە هەڵدەوەرینە سەر زەوی، ئەوەندە زۆر و خێرا، دەیانترساندم. ناوی مانگەکانم بینی،

وەرزەکان، ساڵەکان، سەدەکان، دەتگوت رەشەبا بوون. گەردەلوول بوون. تێکئاڵابوون و لەنێو تەپ و تۆزێکی سەرشێتدا ون دەبوون. دایکم هێشتا تێمراما بوو. هەستم کرد لێم تورەیە. لەم هەموو ماوەیەدا نەمدی یەکجاریش چاو بتروکێنێ. لێوە چرچەکانیشی وا بە یەکەوە نووسابوون من حسێبی ئەوەم دەکرد دەبێ زەمەنێکی چەندە درێژی بوێ تا لێوەکانی لەنێو ئەو هەموو چرچی و لۆچیە لێک بکاتەوە و شتێکم پێ بڵێ. کەچی بێ ئەوەی دەم بکاتەوە من گوێم لە قسەکانی بوو.

" بە قسەم بکە کورم.. نەکەی مەراق بتگرێ ها.. دەتەلەفێی.. مەگەر پێتم نەگوت مەراق وەکو تریاک وایە. سەرەتاکەی چێژت پێ دەبەخشێ، ئەوجا تووشی مەراقت دەکا، دواتر هۆشت دەکوژێنێتەوە، پاشان خوێن لەنێو دەمارەکانتدا دەمەیێنێ، ئەوجا تەراییت تێدا ناهێڵێ، هێدی هێدی لە وزەت دەخا، پەیتا پەیتا داتدەتچۆڕێنێ، دەتچەمێنێتەوە، کرمێت دەکات، بۆگەنت دەکات، ئەوجا رۆحت لەنێو جەستەیەکی بۆگەندا

دەنێــژێ".. بە درێژایی ئەو زەمەنەی ئەو قســەی دەکرد من بێ برانەوە جگەرەم دەکێشا. ناو سەرم پــڕ ببــوو لــە دووکەڵێکی چڕ و خەســت. کەچی لەودیو تەمی دووکەڵ، تارماییە رەشەکەی دایکمم هەر دەدیت، دەتگوت ســێبەری رۆحێکی شەکەتە و لەنێــو ئاوێکی لێڵدا دەلەرێتەوە. بە شــێوەیەک دەمتوانــی لۆچەکانی ســەر لێوەکانــی یەکە یەکە بژمێرم. گوێشــم هەر لــە دەنگی دەبوو. " خاڵۆت مەراق کوشــتی کوڕەکەم،. یەکەمیــن مەراق. ئەو مەراقەی ئــەو گرتی وەک هی کەس نەبوو. دڵۆپ دڵۆپ تواندییەوە. قژی بە ســەرییەوە نەهێشــت. ســوورایی لە روخســاری پەڕی. چاوە رەشەکانی نوقمی نێو دوو چاڵە ئێسقان بوون و تروسکاییان تێدا کوژایەوە. پشتی چەمایەوە. دەتگوت تۆپەڵە بەفرێکی سپی بووە و لەبەر گەرمای هەتاوت داناوە. بە بەرچاومانەوە داچۆڕایە نێو درز و شەقارەکانی زەوی. دواجار چەند پارچە ئێسقانێکی لێ مایەوە لەنێو تورەگەیەکی پێســتا. نە توانای قسەکردنی هەبوو نە توانای لەســەر پێ وەســتان. زۆرجاران

پێم گوت واز لەو مەراقە بێنە برا داماوەکەم. ئامۆژگاریم کرد. خۆم لێ زویر و لالووت کرد. ئەو هەر گوتی " وازم لێ بێنە خوشکێ. خۆت گوناحبار مەکە".. گوتی" من ژیانی ئەم دونیایەم ناوێ کە هەرهێندەی چاو ترووکانێکە". گوتی «من گۆشتی لەش و، جوانی و کولمی گەش و، چاوی رەشی مەخلوقاتە فریودەرەکەی ئەم دنیا هیچە چی لێ بکەم». گوتی "ئەم دنیایە بۆ ئەوانە باشە کە دڵیان پێی خۆشە. رۆژێ دادێ هەمووتان وەک من پشت لەم دنیا هیچە بکەن و خۆتان بۆ ئەولا بتوێننەوە".

تاقە براکەم وای گوت کورەکەم. خاڵۆت، ئەو مرۆڤە جوان و پڕ هێزە لە ماوەیەکی کورت دا، کەوتە بن چڵک و ریش وتووک. ژنەکەی، بە دەستییەوە دیقی کرد و مرد. تاقە کوڕەکەیشی لە داخاندا سەری خۆی هەڵگرت و دەڵێی زەوی درزی تێکەوت و قوتی دا. ئەویش هیچیانی بە خەیاڵدا نەهات. " گوتی من بۆ شوێنێ دەچم ماڵ و منداڵ دادم نادا" تەنانەت فرمێسکێکی بۆ مەرگی ژنەکەی

نەڕشت. کەس نازانێ سیحر و جادووویان لێ کرد، لەمە چێتران چوونە ناو سەری، کەسانێک تەفرەیان داو بەلاڕێیاندا برد. کەس نەیزانی ئەو کابرایە، ئەو بــرا نازدارەی من بــۆ وای لێ بەســەرهات. ئیدی نەهیچی بینی و نەهیچی بیســت.. نەهیچی خوارد و نــە هیچی خواردەوە. هیچی نەکرد. گوتی " من خولْقــاوم تا خۆم تەیار بکــەم بۆ مردن. بۆ ئەمە نەهاتوومەتە سەر ئەم دونیا هیچە جێی تێدا خۆش بکەم. ئا خوشکێ. با قسەی تۆ بێ. ناوی لێ بنێ مەراق. من مەراقی مــردن گرتوومی. ئەو مردنەی کە ژیانی تاهەتایی بەدواوەیە"..

ئەوەبوو کوڕەکەم، خالْۆت بەرەبەیانێک، وەکو هەمــوو بەرەبەیانەکانــی دیکە چووە ســەر گردی قەبران تا لەگەڵ بەشــێک لە مردووانی ئەوێ، کە ئەو پێیانی دەگوت دانیشــتوانی بەهەشت، نوێژی بەیانــی بــکات و، ئیدی نەگەڕایەوە. تا ئێســتاش کەس سەر و سۆراخی نازانێ. هەندێک دەڵێن ئێمە بەچاوی خۆمان بینیمان دای لە شــەقەی دوو باڵ و هەڵفــڕی. ڕۆیــی و لەناو کازیوەی ســپێدەیەکدا

توایـــەوە. ون بوو. هەندێک دەڵێـــن ئێمە چاومان لـــێ بوو، لە ناکاوێـــکا ئەو کابـــرا نوورانیە بوو بە تۆپەڵێ رووناکی وچۆن ئەستێرە گوناحکارەکان لە ئاســـمانەوە دەڕژێنە سەر زەوی، بەهەمان خێرایی ئەوان، هەڵکشـــایە ئاســـمان و لە نێـــو ئەو هەموو ئەستێرانەدا، وەکو پوولەکەیەکی پرشنگدار نووسا بە سنگی ئاسمانەوە..

هەنـــدێ دەڵێـــن بۆتە ئەو حاجـــی لەق لەقەی هەموو ساڵان لەگەڵ هاتنی بەهاردا دێت و لەسەر منـــارەی مزگەوتی ئاواییەکەمانەوە دەنیشـــێتەوە. دەڵێـــن ئەگەر جوان دیقەتی ئەو حاجی لەق لەقە پیرۆزە بدەن روخســـاری ئەوی تێدا بەدی دەکەن. هەندێکیتـــر دەڵێن بۆتە پەڕەســـێلکە و، تەنانەت هەندێک دەڵێن ئەو پەڕەسێلکەی لە ژوورەکەماندا هێلانـــەی کـــردووە بە زمانـــی ئـــەو دواندوومانی. پیرەمێردێـــک دەڵێ ئەوانە هیچی راســـت نین. من خـــۆم بینیـــم بوو بە هەڵـــم. هەڵمێکی ســـپیواژ و روونـــاک و تەنـــک و بۆندار. لـــەو بەرەبەیانییەوە، ئـــەم وڵاتەی پڕکردووە لـــە بۆنێکی خۆش. بۆنێک

دەڵێی لە بەهەشــتەوە دێ. لەدوای بە هەڵمبوونی ئەو، هەر بارانێ بارییبێ من پڕ بە ســییەکانم ئەو بۆنە خۆشــەم هەڵمژیوە. هەموو بارانەکانی دوای ئــەو بۆنی عەتری هەناســەی ئەویــان پێوە بووە. هەندێکیــش دەڵێن لە تاریکایی بەرەبەیاندا چاوی نەبینیــوە، کەوتۆتــە ناو ئەو چاڵە قــووڵ و بێ بنــەی لــە قەراغی لای چەپی گۆڕســتانەکەدایە و بۆخــۆی لەوێ خنــکاوە و گیانی وەرەســی لەنێو جەســتە هەلاهەلاکەیــدا دەرچــووە. هەربۆیــەش هەموو بەرەبەیانیان ئەگەر بچیتە دیار ئەو چاڵەوە، گوێت لە نووزەیەکی کزی رۆحێکی شەکەت و بێزار دەبێت و بۆگەنێکی ناخۆش هەموو ناو ســەرت پڕ دەکات...

گوێت لێمە کوڕەکەم.. هەتاکو وەک ئێمەومانان بە ئاسایی دەژیا عەیبی نەبوو. دواتر کە ئەو مەراقە گرتی ئاوها کۆتایی پێهێنا، کەس هەر نەیزانی چی لێ بەسەرهات و کەوتە کوێ!!

دەتگوت دایکمم لەناو شاشــەی تەلەفزیۆنێکی پــڕ لە تەمتومــان و هەڵم دەبینی و لــە ناکاوێکا

کوژاندیانـــەوە. لە پڕێکا لەبەر چاوانم ون بوو. من ئیدی ڕۆژ و شەوم لێ تێکەڵ ببوون. وەک ئەوەی زیندووشـــم لە مردوو جیا نەدەکردەوە. شەوان کە دەبوا وەک هەموو خەڵکی دیکە خەوتبام، هەر کە پێڵووی چاوەکانم دەخســتنە سەریەک، مۆتەکە و کابوسی ترسـناک وتارمایی و ونبوون و ڕاکەڕاکە وهەڵاتـــن و قیژە و فیـــزاح یەخەیان پێ دەگرتم تا ڕۆژ دادەهـــات. بەرۆژیـــش کە دەبـــوا وەک هەموو خەڵکـــی، تام وبۆنی ژیان هەڵمـــژم، لە کونجێکی کەمڕووناکیـــدا، خۆم گرمۆڵە دەکـــرد و نەمدەزانی نوســـتووم یان مردووم. جارێکیان، کە ئێســـتاش نەمزانی شـــەو بوو یان ڕۆژ، لـــە خەونمدا بوو یان لە واگایی، پرســـیم " ئـــەرێ دایە، ئەی باوکم چی بەســـەر هات"؟ کاتێک سەری هەڵبڕی و سەیرێکی قەدی دیوارە چڵکنەکەی بەرامبەری کرد، دەتگوت هەمـــوو چیاکانـــی وڵات لەنـــاو ســـەری ئـــەودان، ئەوهەندە بە قورسی سەری هەڵبڕی. لە گەڵیشیدا گوتـــی " باوکتیش بە مەراقـــی دووهەم ڕۆیی. ئەو هێشـــتا منی نەگواستبۆوە، بەڵام دڵمان بەیەکەوە

بوو. ئەوسا منیش وئەویش قۆزترین کوڕ وکچی دەڤەرەکەمان بووین، شایی نەدەکرا ئەگەر ئێمەی تێدا نەبووینایە، هیچ ئاهەنگێک بەڕێوەنەدەچوو ئەگەر ئێمە رەونەقمان پێ نەبەخشیبا. وێردی سەر هەموو زمانێک بووین. ئێمە لەنێو بڵندگۆی شاردا یەکەمین بانگی خۆشەویستیمان دا. لەدوای ئێمە بوو، ئیدی هەمووان قەپێلکەی ترسیان شکاند و لە ماڵەکانیان هاتنە دەرێ. بەڵام باوکت زوو، زووتر لەوەی چێژی ژیان لە چاوەکانمانەوە بگوازینەوە ناو دڵ و دەروونمان، کرمەکانی سەری جوولاو خزایە نێو مەنجەنیقی سیاسەتەوە. ئەو بەشدار بوو لە یەکەمین کۆبوونەوە، کە بۆ ئازادی وڵات بەسترا. خەڵک وایان دەبینی رۆژ دوای رۆژ بەرزتر دەبێتەوە. بەڵام ترسێ لە دڵم نیشتبوو، دڵی چی، ترسێ هەموو گیانمی داگیر کردبوو، بۆیە من دەیمبینی رۆژ دوای رۆژ زیاتر نوقمی نێو مەنجەنیقەکە دەبێ. نازانم لەکوێ، بەڵام کەوتبووە ناو مێشکم کە حیزب و سیاسەت وەکو گێژەلووکی نێو رووبارەکان وان. هەر ئەوەندە کەوتیتە ناوییەوە

تا هەناسەت لێ نەبڕێ ڕزگاربوونت نیە. پێم گوتبوو سیاسـەت دنیایەکی لیخن و درۆزن و بێ وەفایە. بـەڵام ئەو تازە ئیدی کەوتبـووە ناو گێژاوەکەوە. کە سـەیریم دەکرد چاوەکانم ترسـیان لێ دەتکا. تازە هەفتەیەک بوو منی گواستبۆوە گرتیان. کاتێ بەربـوو تۆ تازە خرابویتە بەر خوێندن. یەک دانە نینۆکیـش بە پەنجەکانی دەسـت و قاچەکانیەوە نەمابـوو. هەموویـان بە کەلبەتان هەڵکێشـابوو. بەڵام هێشـتا کفتـی دانەمرکابـوو. کرمەکانی نێو سەری هێشـتا لە جووڵە دابوون و دەیانوروژاند، تیختیخەیان دەدا، ختۆکەیان دەکردەوە. هەرکاتێ مـرۆ ڕەش و لوتپـان و لێـو ئەسـتوور و چـاو دەرپۆقیوەکانی دەبینی هەرلەخۆیەوە هەڵدەچوو. مسـتی بـە دار و دیـواردا دەکێشـا. گوێچکـەی بەردەوام دەتکوت بە رادیۆکەوە نووساوە هەر کە، هەواڵەکانی دەبیسـت چاوەکانـی کتوپڕ، دەبوون بە گۆمـی خوێن. پەنجەکانی هەردوو دەسـتی وا دەکردە مسـت و دەیانیگوشـی، دەمگوت ئێسـتا دەمارەکانی دەستی دەقرتێن. دەکەوتە نێو کۆڵان

و شـــەقامەکان و دەیکردە هات و هاوار و، شـــار و ئاوایی دەکـــردە پارچەیەک لە ئاگر، " ئەم خێو و درنجانـــە، ئەم مرۆ ناشـــیرینانە هی ئێرە نین، هی ئـــەم وڵاتە جوانـــە نین، ئەوانە بنچکە دڕک و داڵن و دەبێ بچنەوە نێو لمســـتانەکەی لێیەوە هاتوون. ئـــەوان بیانین و وەک خاوەن ماڵێکی دڵڕەق و بێ بـــە زەیی لە خێراتمان دەخۆن و شەقیشـــمان تێ هەڵدەدەن و سووکایەتیشـــمان پێ دەکەن، ئەوانە کوندەپەپووی شـــوومن. دەبێ بڕۆن. دەبێ بڕۆن.. دەبـــێ بڕۆن. دیســـان گرتیانەوە. ئەمجـــارە کاتێ هاتەوە دەســـتی راســـتەی نەمابوو، تۆش قۆناغی یەکەمی خوێندنت تەواو کردبوو. جاری دواتر هاتەوە چاوێکیان دەرهێنابوو. کاتێ کەوتە شاخەوە، تازە قۆناغی هەرە ناخۆشی ژیانی ئێمە دەستی پێکرد. چونکە لە شەڕێکا قاچی پەڕی و هێنایانەوە. ئەوە بـــوو لـــەدوای رزگاربوونـــی وڵات، کەمتر لە نیوەی جەستەی مابوو. بەڵام ئەو دەیگوت دەست و قاچ و چـــاو گرنـــگ نیە. بەس نیە ســـەرم پێـــوە ماوە تـــا بەرز بەرز رایگـــرم. بەڵام ئیدی کێ لە دەرگای

دڵی کەسێک دەدات کە چیدی ناتوانێ شەڕیان بۆ بکات. لەگەڵ ئەوەشـــا هەر کۆڵی نەدا. بە شـــەلە شەل دەڕۆیی و لە شوێنێکی بەرز دادەنیشت و بە شان ومێژووی حزبەکەیدا هەڵدەدا.

ئەمە بوو لە قۆناغی کرمێبوونی وڵات و شەڕی نێوخۆییـــدا، لایەنی ئەولاتر گرتیان و کاتێ هاتەوە زمانیان لە بنڕا بڕیبوو.

کەوتە سەر دەســـتم. منیش دەبوایە دەربچم. شـــەو بوایـــە، ڕۆژ بوایە.. دەبوایـــە دەرچم نانتان بـــۆ بێنـــم. ئێوارەیـــەک نەخـــۆش کـــەوت. هەموو دەرگاکانـــم کوتا کـــەس نەیگوت کێیـــە. دەتگوت لاســـتیقێکی پاککەرەوەیان بەسەر ناوی باوکت دا هێنابوو لە ئەزەلەوە ســـڕیبوویانەوە. ناویم دەگوت نەیاندەناسی. شـــەڕەکانیم باس دەکرد دەیانگوت کوا، شەڕی وامان گوێ لێ نەبووە. وێنەیم نیشانیان دەدا ســـەریان بـــادەدا و هـــەر تەنها لـــچ و لێویان هەڵدەهێنا و دەیانگوت " خوا بدا" نەخۆشـــیەکەی دای لە قاچـــی. دکتۆرێک بەمەرجێک بۆی بڕیەوە کـــە مانگێک لەماڵـیـــان بە خۆڕایـــی خزمەتکاریی

بکەم و بە دکتۆرەکەش رابگەم. ماوەیەک دواتر دەستەکەیشیان لە بنڕا بڕییەوە. دواتر دای لە چاوی و ئەویشی کوێر کرد. لە هەژمەتا هەر سەری رادەوەشاند. هیچی پێوە نەمابوو. هیچ، وەکو کۆتەرە دارێکی رزیو، کە هەموو لکەکانیان پەل دابێ. تەنها من لەسەر راوەشاندنە شێتانەکانی تێدەگەیشتم. ئەو دەیویست بڵێ ئەی کوا.. رێگای مردن لە کوێیە..

ئێوارەیەک خستمە نێو عارەبانەیەک و بردم تا سەرەنجامی خەباتکارێک لە نێو تەلەفزیۆنێکدا نیشانی خەڵکی بدەن. بەڵام هیچ تەلەفزیۆنێک ئامادە نەبوو ئەم دەعبا سەیرە بخاتە سەر شاشەکەی و میزاجی خەڵک تێک بدات. هەر بە عارەبانەکەوە بردم لەبەردەم پەیکەری ئازادی، کە لەم دواییانەدا لەنێو پارکی شاردا دروستیان کردبوو دامنا ولەوێ جێم هێشت. هەفتەیەک دواتر چووم بیهێنمەوە بەڵام لەوێ نەمابوو. پاسەوانی پەیکەرەکە گوتی" تۆ خاوەنی ئەو دەعبایەی دەزانم. برۆ لێرە مەوەستە، بە شوێنت دا دەگەڕێن. لەلایەک

ژینگەت پیس کردووە و لەلایەکیش سـووکایەتیت بـە پەیکەری ئازادی کـردووە. بۆن کەڵاکی تۆپیو ئـەو ناوەی داگرتبوو. ئەگەر خەزووری بەرپرسـی پارکەکە نەبوومایە لە پاسەوانیشـیان دەخسـتم. دەعبـا بۆگەنەکەیشـیان خسـتە نێـو ئۆتۆمبێلە زبڵرێژەکەی شارەوانی و بردیان".

دایکـم نیگاکانـی لە قەد دیـوارە چڵکنەکەی بەرامبەری گرتەوە، وا سـەری بەردایەوە دەتگوت هەمـوو چیاکانـی وڵاتت بە ملی دا هەڵواسـیوە. سـەری ئەوهەندە بە قورسـی بەردایەوە من گوتم ئیـدی هیچ هێزێک ناتوانێ سـەری پێ هەڵبڕێ و چیدی من روخسارە هەزار لۆچەکەی دایکم نابینم. چاوەکانی دایکم لەدوای مەرگی باوکم، شێوەی دوو دار مەیتیـان بەخۆوە گرتبوو. لەنێو دارمەیتەکەی چاوی راستەی دا باوکم خەوتبوو، لەنێو دارمەیتی چاوی لای چەپیشی جاجمێکی دەق دراویان دانابوو بەڵام هێشتا کەس نەچوبووە ناویەوە. منیش هەر لەو دارمەیتە بەتاڵەی نێو چاوی چەپی دەترسام. هەترەشم چوبوو. قەت زاتی ئەوەم نەدەکرد زیاتر

لە یەک چاو تروکاندن سـەیری بکەم. دەترسـام. زەندەقم دەڕژا. مووچرکەی مەرگ بە هەموو گیانمدا دەهات و پێستم دەبوو بە پێستی ژووژک و هەزاران دڕکیـان لێ دەچەقی. بۆیـە زوو چاوم دەتروکاند و نیـگام شـۆڕ دەکـردەوە بەرپێم. ئـەو هەندێک لێمڕاماو گوتی " مەراقی سـێهەم.. ئاگاداری خۆت بـە کوڕەکەم، مەراقی سـێهەم بتگرێ دەتەلەفێنێ ها. نەکەی. مەراقی سێهەم لە هەردووەکەی دیکە کوشندەترە...".

دەتگوت بە بەردەوامی "تا"یەکی گەرمم لێیە. هیچ شتێکم وەکو خۆی نەدەبینی. ئێستاش نازانم دایکـم مردبوو یان زیندووبوو. ئاخر زیاتر ئەوم لە خەونەکانمدا دەدیت. کەمتر رێک دەکەوت وا هەست بکـەم لە واکاییدا بینیبێتم. بـەڵام ئەوەم لە بیرە بەرەبەیانێک ناو ژوورە دووکەڵگرتووەکەمان پڕ بوو لـە پیرێژنـی رەش و چرچ و ناشـیرین، کە ئەوان رۆیشتن دایکمیش لەبەر چاوانم ون بوو. ئەوسابوو زانیم کـە مـردووە. چونکە لـە قەرەباڵخیەکەدا، جاجمە دەقدراوەکەی نێو دارمەیتە بەتاڵەکەی نێو

چاوی چەپیم بەدەســت مامەمەوە بینی. دواتریش کە دایکمیان بەرەو گۆڕســتان برد هەمان جاجمم بینی بەســەر ئەو دارمەیتــە دادرابوو کە دایکمیان تێدا بەرەو گۆڕســتان دەبرد. لەوە بەدواوە هەستم کرد ژیان لەسەر گۆی زەوی کۆتایی پێهاتووە. هەر تەنهــا مــن ماوم و دنیایەکی بچــوک و دووکەڵاوی و ســارد. قوڵپێکی خەســتی گریان لە ناوەڕاستی قورگــم قەتیس مابوو. زۆر حەزم لــە گریان بوو. بەڵام قەت نەمتوانی بگریم. لەوبەدوا جگەرەیەکی زۆرم دەکێشــا. ئەوەندەی لەبیرم بێ هیچ خواردنم نەدەخوارد. تەنها جگەرەم دەکێشــا. مامەشم بەر لەوەی دوو جەڵتەی هاوکات لێی بدات و بیکوژێ، کچەکــەی خــۆی بە ملمدا ســاغ کــردەوە. مامەم بازرگان بوو. ســپێدەی رۆژێکی ســاردی زستان، بارێکی زەبەلاحی قاچاغی بەرەو ســنووری باکوور بەڕێ کردبوو، لەهەمان کاتیشدا بڕیار وابوو بارێکی قاچاغــی لەو قورســتر لە ســنووری رۆژهەڵاتەوە ئەمدیوبێ. ئەو لە دوای نوێژی بەیانی لە مزگەوت نەهاتــە دەرێ. ســەری بەرزکردبــۆوە و هــەردوو

دەستی پان کردبۆوە و نزای دەکرد. دەپاڕایەوە تا بارەکەی ڕۆژهەڵات بە سەلامەتی ئەمدیو بێت و ئەوەی باکووریش بەسەلامەتی ئاودیو بێت. دواتر وەک ئەوەی لە غەیبەوە بەڵێنیان پێ دابێ بە ئاسوودەیی لە مزگەوت دێتە دەرێ و لەسەر کۆڵانەکەی ئەولاتری مزگەوتەکەوە، هەواڵیان پێدا بارەکەی سنووری ڕۆژهەڵات دەستی بەسەر داگیراوە. دەکەوێتە سەرئەرز و دیارە جەڵتەی دڵ لێی دەدا و نیوە مەرگی دەکات. دەڵێن سێ چرکە دواتر هەواڵی دەست بەسەرداگرتنی بارەکەی باکووریشی بەبن گوێدا دەچرپێنن و جەڵتەی مێشکیش لێی دەدا و هەر هەمان ڕۆژ لە نەخۆشخانە گیانی لە دەست دا.

دڵم بەردەوام وەکو میزڵدانێکی فووتێکراوی لێهاتبوو. دەترسام نووکە دەرزییەک بیتەقێنێ. هەمیشە دڵم دەگوشرا. دواتر زانیم دایکم لەنێو مێشکی مندا نێژراوە. جارنا جارێ سەری لەبن جاجمەکەوە دەردەهێنا و هەر تێمڕادەما و سەری بادەدا. بەڵام چاوەکانی نەمابوون. ببوونە دوو شارە

مێرووله‌ی شـــاخدار. دوو ریزه ددانه رزیوه‌که‌یشی به‌سه‌ر یه‌کدا قه‌ڕسابوون و بۆی لێک نه‌ده‌کرانه‌وه. جارێکیـــان کچـی مامـــه‌م_ کـــه قـــه‌ت نه‌بـــوو به هاوسه‌رم_ پێی گوتم " تۆ که خه‌وت لێ ده‌که‌وێ ده‌ڵێـــی مردوویت. لێت ده‌ترســـێم" . هـــه‌ر وایش بوو. من هه‌موو شـــه‌وێک ده‌مـــردم و ده‌خزامه نێو مێشکم و، دایکم لایه‌کی جاجمه‌که‌ی هه‌ڵده‌دایه‌وه و له ئامێزی راده‌کشام و به‌یانیان هه‌ڵده‌ستامه‌وه. هه‌مـــوو رۆژێکیش مامۆســـتا ده‌م وچاوی تێکده‌نا و لووتـــی ده‌گـــرت و ده‌یگـــوت " بۆنی مـــردوو له یه‌کێکتـــان دێـــت" . هه‌مـــوو هاوپۆله‌کانم ســـه‌ریان شۆڕده‌کرده‌وه و خۆیان بۆن ده‌کرد، هه‌ر من نه‌بێ. چونکه ده‌مزانی بۆنه‌که له‌من دێ. بۆیه که‌ســـم لا دانه‌ده‌نیشـــت. نه‌ک له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌ستیان کردبێ بۆنـــی مردووم لێ دێت، له‌بـــه‌ر ئه‌وه‌ی وایانده‌زانی نه‌خۆشییه‌کی ترسناکم هه‌یه بۆیه به‌رده‌وام ره‌نگم سیسه و چاوه‌کانیشم کزن. هه‌موو شه‌وێک بڕیارم ده‌دا لـــه چوونـــه لای دایکم و راکشـــان له ئامێزی ئـــه‌ودا له‌نێو دارمه‌یته‌که‌دا یاخی ببم. ده‌مویســـت

جاجمە نەفرەتیەکەی لەسەر هەڵدەمەوە و هەموو ئێسـک و پرووسـکە دارزاوەکەی لەنێو هاوەنێکی گـەورەدا بکوتم، وردوخاشـیان بکـەم و بیاندەم بەدەم رەشـەبای بەیانیەکی ئەو زسـتانە سارد و تووشەدا. بەڵام کە خەوم لێ دەکەوت سەر لەنوێ دەبوومەوە بە منداڵە دەستەمۆکەی جاران و وەک هەمیشە بە ئەسپایی لە تەنیشتی ئێسکە پەیکەرە رەق و ساردەکەیدا رادەکشام.

لەگەڵ زرینگەی کاتژمێرە زەنگدارەکە راپەڕیم و، لایەکـی جاجمەکەم هەڵدایەوە و بە ئەسـپایی لەنێو دارمەیتەکەی دایکم هاتمە دەرێ. ئەوەندەش بە ئەسپایی تا دایکم لە مردنەکەی واگا نەیێتەوە. ئـەو بەیانییـە لەهەمـوو بەیانییەکانی پێشـووتر شـەکەتتر و بێزارتر بووم. شـەوی رابـردوو هیچ خەوم نەبوو.

هەر کـە پێڵـووی چاوەکانم دەکەوتنە سـەر یـەک و دڵۆپـێ خەو دەتکایە نێـو چاوانم، دایکم رایدەپەڕانـدم. " مەراقی سـێهەم لـە کەمینتدایە کوڕەکەم. وریابە. ئەمەیان تونێلێکی بێ کۆتایی و

تاریکە. لێی دەرناچی. دەتەلەفێی، لێی دەرناچی".

مێروولەکانم لە سەر وگوێلاک و جەستەمدا تەکاند. ماوەیەک بوو، کە لەبەرامبەر ئاوێنە رادەوەستام لەباتی خۆم، تارماییەکی تەنک ولێڵم تیادا دەبینی. لەترسا خێرا لادەچووم. کچی مامەم_ کە قەت نەبوو بە هاوسەرم_ مرخەی خەوی دەهات. ماوەیەک تێیڕامام. لەگەڵ ئەوەیدا برێکی زۆر جوان بوو، بەڵام من هەر بەزەییم پێیدا دەهاتەوە. مامەم رۆژێک بەر لەوەی دوو جەڵتەی هاوکات لێی بدات و بیکوژێ، پێی گوتم" ئامۆزاکەت... بەتۆ دەسپێرم کوڕم. ئەو بێ کەس و تەنهایە. بەتۆی دەسپێرم" منیش نەمدەزانی کە بەمنی سپارد دەبێ چی لێبکەم. چونکە من لەو بێ کەستر و تەنها تر بووم و منیش دەمویست خۆم بەکەسێک بسپێرم، کە لەم هەموو شەوانە مردن و بەیانیان زیندوو بوونەوەیە رزگارم بکات. بۆیە هەر ئەوەندەم پێکرا بەزەییم پێیدا بێتەوە. هیچی دیکەم لەدەست نەدەهات. ئاخر دوو بێکەس و دوو تەنها دەبێ چیان لەدەست بێ بۆ یەکدی.

منێک کە خۆم نەبووم چۆن بۆم دەکرا پاشکۆیەکی پێسپێردراو بەدوای خۆمدا رابکێشم. ئەویش، کچی مامەم دەڵێم، لە بێ کەسیی منی قبووڵ کرد بە کەسی خۆی و تەنهایی خۆی لەگەڵدا بەش کردم. بەڵام دەشیزانی من کەس نیم و ساتێکیش لە تەنهایی و بێکەسی ئەو پڕ ناکەمەوە. ئیدی لە ناچاری خۆی پێدا هەڵواسیم بۆ ئەوەی لە دەریای هاروهاجی ئەم رۆژگارە سەیرەدا نەخنکێ. ئەگینا لەوە گەیشتبوو من بێچارەترم لەوەی تروسکاییەکی ژیانی پێ ببەخشم. لەم جەستە سارد و سڕ و بۆن مردوو گرتووەی من و، لەم رۆحە سەرگەردان و شەکەت و وەڕەسەی من کوا دەکرێ تروسکاییەکی لێ بەدی بکرێ. ئەو، کچی مامەم ـ کە قەت نەبوو بە هاوسەرم ـ دەیگوت "ئەو هەندە ساڵەی کە لەسەر گۆی ئەم زەوییەین دەبێ بژین. هەرچۆنێکی بێ دەبێ بژین. گوناحە بە مردوویی بژین". قسەکانی وەک مێروولە شاخدارەکانی نێو کونە چاوەکانی دایکم، کە شەوانە جەستەیان دادەپۆشیم و تەراتێنیان بەسەر سەر و گوێلاکمدا

دەکـــرد، ئازاریان دەدام. توورەیان دەکردم، هێندە توورەیان دەکردم دەتگوت ئێســتا ســەرم دەبێتە بۆمبێــک و خۆی بەرۆحمــدا دەتەقێنێتەوە. بەڵام دڵم ڕێگەی نەدەدا بەســەریدا بقیژێنم. هەردەبوایە بە بەزەییەوە تێی بڕوانم و سەرێکی بۆ بلەقێنم و بڕۆم. ئەم بەیانییەش هەر وام کرد. کەمێک بەدیار مرخە و چاوە نووقاوەکانی دامام و هەر بە هەمان ئەسـپایی کە لەنێو دارمەیتەکـەی دایکم دەهاتمە دەرێ، لەمــاڵ دەرچــووم. بارانێکــی زۆر خــۆش دەباری. کە منداڵ بووم و ئەو شێوە بارانە دەباری، حەزم لێبوو داوە بارانێک بگرم و پێیدا هەڵکشـێم بۆ سەرێ. ئەوهەندە بڕۆم بزانم سەرەتای ئەو داوە بارانــە لــە کوێوەیە. دواتر باوەشــم وەردەهێنا لە چەپکێــک داوە باران و لوولــم دەدان بەخۆمەوە. بۆن و بەرامەیەکی سەیر لەو بارانە دەهات. مرۆڤی مەندەهــۆش دەکــرد. گەڕامــەوە ژوورێ. هەرچی دیوانە شیعرم هەبوو، هەموویم هێناو خستمنە سەر کەپرە مێوەکەی حەوشەوە. دواتر بتڵە شەرابەکەم هێنــا و چووم لە ژێر ســاباتی کتێبە شــیعرەکان

دانیشتم. ئێستا وام هەست دەکرد شیعرم بەسەردا دەبارێ. دەتگوت دێرە شیعرەکان دەبوون بەخوێن و دەرژانــە نێــو دەمارەکانی جەســتەم. دەتگوت پەیڤــە شــیعرییەکان تنــۆک تنــۆک دەتکانە نێو رۆحــم ودەیبووژاندمەوە. ئیدی بۆنــی مردووم لێ نەدەهــات. دەمارەکانی جەســتەم ببوون بە ژێ و ترپەی دڵم ئیقاعی مۆســیقایەکی پڕ لە رۆمانسی دەژەنی. من زیندوو ببوومەوە. ئەرێ. بارانی شیعر و ســیحری مۆسیقا و جادووی شەراب.. لەژێر ئەو ســاباتە و لە نێو ئەو کەپــرەدا، ئیدی مردن هیچ مانایەکــی بۆ نامێنێ. زەمەنێکی زۆر. یەکجار زۆر لــەوێ مامەوە. هەردەتگــوت لەنێو بازنەی زەمەن دەرچوومە. چونکە ئێســتایش نازانــم بڵێم چەند ســاڵ، یــان چەند ســەدە لــەوێ مامــەوە. نازانم چەند دیوانە شــیعرم بەسەر دا باری. نازانم چەند پارچــە مۆســیقام ژەنی. هەروەک ناشــزانم چەند دەریا شــەرابم خواردەوە. تەنهــا کاتێک فرێدرامە ســەر زەمینــی هۆشــیاری، کە زانیم لــەم هەموو بەزم و خۆشییەدا شتێکم لێ ونە. شتێکی دیکەم

پێویسته. ڕۆحم هاوارێکی دیکەی لێ هەڵدەستێ. نازانم مانگ بوو یان خۆر، یان ئاسمانێک ئەستێرە بوو، یان وێنەیەک بوو بە بەرۆکی ئاسمانەوە هەڵواسرابوو، لەنێو فەزای نیگامدا بەخێرایی پژمینی پەپوولەیەک دەدرەوشایەوە و ون دەبوو. هەستامەوە. ملی ڕێگایەکم گرت. بەسەر گەلێ شاخ و چیادا سەرکەوتم. لەگەلێ ڕووبارم دا. چەندەها دارستان و ڕەزو باخم بڕی. تا لە پڕێکا بینیم. ترسام. وام هەست کرد هەڵکشاومەتە ئاسمان. هەمان وێنە. دەتگوت بوومەتە دار بەڕوویەکی زەبەلاح و ڕەگی قاچەکانم تا دوا نهۆمی زەوی ڕۆچوونەتە خوارێ. چەقیبووین. هیچ نەماندەتوانی بجووڵێین. دەتگوت مرۆڤەکانی ناو فلیمێکین و منداڵێک دوگمەی ڕاوەستانمانی لەسەر کۆنترۆڵی تەلەفزیۆنەکە داگرتووە. ئەویش بە مەودایەک لەولاترم ڕاوەستابوو. مەودای نێوانمان کورت بوو، هەر هەندەی مەودای نێوان زەوی و ئاسمان. چونکە هەستم بە عەتری هەناسەی دەکرد کە دەگەڕا بەنێو خانەکانی ڕۆحمدا. دەتگوت تازە لێوەکانم

لە ماچکردنی بوونەتەوە، هێشتا تەڕایی لێوەکانی دەگەڕا بەنێو وشکایی دەمارەکانی مێشکمدا. قژی بۆنــی نێرگزی بەربارانیان لێ دەهات. پێســتی لە ئاوڕیشــمێکی پەمەیــی روون دەچــوو. چاوەکانی هێندە شــینێکی زوڵاڵ بوون نەتدەزانی ئاســمانە لەنێو دەریادا رەنگی داوەتەوە یان دەریایە و تۆ لە ئاوێنەی ئاســماندا دەیبینی. لەوە دەچوو هەزاران ســاڵ بێ، یەکدی بناسین و لێکدی بزر بووبێتین. ئــەو لێوەکانــی لێک نەکردەوە بــەڵام من گوێم لە مۆســیقای دەنگی بوو کاتێ گوتی " تەمەنێکە بە دواتدا دەگەڕێم. لە کوێ بووی ئەو هەموو ساڵە"..

چەنــد حــەزم کــرد بەرتەقای ئەســتێرەکانی ئاســمان چــاوم پێــوە بوایــە تــا خێراتــر فریای ســەیرکردنی هەمــوو جوانییەکانی بکــەوم. لێوم کەوتە سەر نەرمەی گوێچکەی کاتێ بە چرپە پێم گــوت " بە دواتدا دەگــەڕام. ونم کردبووی. فریای ژماردنی ئەو ســاڵانە ناکەوم کە بەدواتدا دەگەڕام. بەڵام دواجار ئەوەتام. لە بەرامبەرت. تا پێت بڵێم خۆشتم دەوێ"..

ئەو باڵەکانی کردەوە تا بەرەو ئامێزی من بفڕێ.

کەچـی لە پڕێکـدا بەرچاوم تاریـک داهات. وەکو ئەوەی کتوپڕ پەردەیەکی تاریکمان بەسەرخۆماندا دابێـت. دنیا نوقمـی تاریکییەکی ترسـناک بوو. برووسـکە لە چەخماخەی دەدا بـەڵام دەرەقەتی ئەو تاریکییە خەستە نەدەهات. تریشقەی هەور وڕ وکاسـی کردبووم. هاوارم بە هیچ کوێ نەدەگەیی. وەکـو شـێت بە دەوری خـۆم دا دەسـووڕامەوە. وەکـو کوێر پەلم دەکوتا. دەتگوت سـندم کراوم. نەمدەتوانی لە شوێنی خۆم بجووڵێم. نازانم چەند سـەدەی زەمەنی لەوێ، لەناو ئەو تاریکییە چڕ و ترسناکە دا هەر هاوارم کرد. ئەوەندە دەزانم کاتێ رووناکییەکـی لێڵ کەوتەوە ئەوم نەبینی. هەرچی چـاوم گێـڕاو هاوارم کـرد، بۆنم کـرد و، گەڕام و سـووڕام بێهوودە بوو. سـاڵەهای ساڵ لەوێ، لەو شوێنەی ئەوی لێ وەستابوو، بەدوای دا گەڕام هیچ سوودی نەبوو. وەکو کۆللارەیەک داوەکەی پچڕابێ و بایەکـی بەهێـز بردبێتی لێم ون بـوو. ئەوەندە گەڕابووم پێست وگۆشت بە بنی پێکانمەوە نەمابوو.

سـەر وسـیمای پڕ لە چرچ و لۆچم کەوتبووە بن ریشێکی درێژ و چڵکن. گۆشتی جەستەم هەمووی توابۆوە. ئێسـقانەکانم باریک ببوون. قسـەکردنم لەبیر چوبۆوە. هەموو جارێک کە شوێن پێیەکانی ئەوم هەڵدەگرت دەگەیشتمە ناو گوندێک. خەڵکی گوندەکـە هەموویـان لێـم دەترسـان. دەیانگوت " ئەوە دیسـان شـێتەکە هاتەوە. هەڵێن". تەنها پیرەمێردێکی ریش چەرموو لەو دوورە دەوەسـتاو نیـگای پڕبوو لە بەزەیی، کاتێ تێی دەڕوانیم هەر سـەری بادەداو دەیگوت " غەزەبی ئاسمان رۆژێک تۆڵەی ئەو شـێتەمان لێ دەکاتەوە و گوندەکەمان نغرۆ دەکات.. بەڵام کەی.. نازانم".. هەستم دەکرد ئەو شتێک دەزانێ. بەڵام ئەقڵم لەکارکەوتبوو. فامی ئەوەم نەدەکرد بچم سۆراخی خۆشەویستەکەمی لێ بکـەم. ئەویش نەیدەوێرا زۆر نزیکم بکەوێ. ئیدی لە پەل وپۆ کەوتم. لە قەراخی گوندەکە زەمینگیر بووم. بەرەبەیانێکی زوو، گوێم لە دەنگێک بوو، لە دەنگی پیرەمێردە ریش چەرمۆکە دەچوو، گوتـی " تۆ مەگەر نەتدەزانی لەم دەڤەرە، خۆشەویستیی،

گەمەکردنە بە شــەرەفی پیــاوەکان. ئەوە گریمان تــۆ غەریبی و نەتدەزانی، خــۆ "ئەو" خەڵکی ئەم وڵاتەیە و دەیزانی خۆشەویســتی هێشتا لێرە لەوە حەرامترە کە گۆشتی بەراز بە شەرابەوە بخۆی. ئەو ئێوارەیەی هەردووکتان باســتان لە خۆشەویستی دەکــرد، پیاوانــی تــوورەی ئــەم گوندەبڕیاریاندا کچەکەیان بهێننەوە و لە رێورەسمێکی زۆر شکۆداردا ئاگــری غــەزەب لە جەســتەی رووتی بــەردەن و بــۆ ئەوەی ســووکایەتی بە مردووانی گۆڕســتانی گوندەکەمــان نەکــرێ، خۆڵەمێشــی جەســتەی بکەنــە نــاو تورەگەیــەک و ســوارچاکی گوندەکە بیبــا لە دوورترین و قووڵترین دەریای ئەوســەری وڵاتــی بهــاوێ. لــەو رۆژەوە قــات و قــڕی کەوتە نێــو گوندەکەمانــەوە. هیچ منداڵێکیــش لە دایک نەبــوو. تا ئەمڕۆش روونــاکــی و گەرمایی خۆرمان نەبینــی. لافاوێکیش هەموو گۆڕســتانەکەمانی بە مردووەکانمانەوە راماڵی و بردی. دەشــزانم نزیکە ئەو رۆژەی گوندەکەیشمان بە یەکجاری نغرۆ ببێ. بــەڵام کەی. ئەمە هەر لە عیلمی ئەو دایە". نازانم

پیرەمێردەکە هیچی دیکەشی گوت یان نا. چونکە مــن هاتبوومــەوە مــاڵ. کچی مامــەم _ کە قەت نەبوو بە هاوسەرم_ هێشتا لە خەو هەڵنەستابوو. بۆ ئەوەی واگای بێنم چوومە ســەروەختی دایکم. لایەکی جاجمەکەم هەڵدایەوە و بە هێواشی خزامە نێو دارمەیتەکەوە و لە تەنیشت دایکم درێژ بووم. هەستم بە هێڕشــی مێروولە شاخدارەکان کرد کە هەردوو چاویان هەڵکۆڵیم و لەنێو کاسەی سەرم دا پەنگیان دایەوە. دەنگێ لەودیو ددانە بەسەریەکدا قەڕسـاوەکانی دایکم کەوتە بەرگوێم " سەرەنجام کەوتیتــە داوی مەراقەوە کوڕم. بە گوێمت نەکرد. ســێهەمین مەراق تۆشــی تەلفانــد. دە ئاوها بمرە بۆخۆت کوڕەکەم. دە ئاوها بمرە..

دیوارەکانی ژوورەکەی لێ وێک هاتبوو. بنمیچەکەیشی دابەزیبوو خوارتر. هەستی دەکرد ئیتر هەوایەک لە فەزای تەنگ و بەرتەسکی ژوورەکەیدا نەماوە بۆ هەناسە هەڵکێشان. دەتگوت دەستی بە بەردەوامی لەسەر قورگێتی و سات بە سات پتر دەیگوشێ. دادەنیشت. هەڵدەستایەوە. هەموو ماسوولکەکانی لەشی گرژ ببوون. یەکێ، دەمارەکانی جەستەی لێک رادەکێشا. سەری وەکو میزڵدانێکی لێ هاتبوو منداڵێک بێ راوەستان فووی تێ بکات. دەتگوت تازە لەژێر دار و پەردووی خانوویەکی دارماو دەریانهێناوەتە

دەرێ. هیچ هەستی بە گەرمایی خوێن نەدەکرد بەنێو دەمارەکانی لەشی دا بگەڕێ. سارد، وەک جەستەیەک لە بەستەڵەکی لێ هاتبوو. زام گەیشتبووە نێو ڕۆحی. گوێی لە رمبە رمبی کوتانی دڵی بوو. دەتگوت بۆمبێکە و هاکا بتەقێتەوە. سەرەتای ئاشنایەتیان وەکو شریتێکی سواوی فیلمێکی کۆنی لێ هاتبوو هەمیشە لەنێو زەینیدا دووبارە و سەدبارە خۆی نمایش دەکردەوە. وەکو هەموو ئاشنایەتییەک قسەکانیان خۆش بوون. نا، قسە نەبوون، هەر وشەیەک دەتگوت نوقڵێکە و لە دەمیان دەردەچێ. کە لێکدی رادەمان هەنگوێن لە نیگایان دەتکا. هەناسەیان بۆنی نێرگزی بەهارانی لێدەهات. بەهەر شەقام و کۆڵانێکدا گوزەریان کردبا ئەو ناوەیان پڕدەکرد لە عەتری نێرگز. سەیری هەر شوێنێکیان کردبا نێرگزی لێ سەوز دەبوو. خەڵکیان مەندەهۆش کردبوو لە بۆنی نێرگز. بەیانیان لە شار، هەرکەسێ زووتر دەرگای ماڵەوەی کردبایەوە هەناسەیەکی درێژی هەڵدەکێشاو مێشکی پڕ دەبوو لە عەتری نێرگز.

کامـــۆ پێی دەگوت "نێرگز، تۆ شـــارت خنکاندووە لـــەو بـــۆن و بەرامـــەی خۆت، تۆ چیـــت لە خەڵک کردووە. هەمووی عاشق بە بۆنی نێرگز بووە. ئەی من دەبێ چەند بەختەوەر بم خودی نێرگز ئەوەتا لـــە ئامێزی من دایـــە. وەرە با برۆین نێرگز. برۆین خۆمان لە شـــوێنێ بشـــارینەوە. با چاوەزارێ لێت نـــەداو ماڵوێرانم کا. بـــا یەکێ نەتفرێنێ و بەهاری رۆحم هەڵوەرێ..." لە بەرامبەر مێزی ئارایشەکەی دانیشت. چاوەکانی لەنێو فرمێسک دا خنکابوون. ئـــەو ئیدی لەچاوی کامۆدا ژاکابوو. ســـیس ببوو. نـــە جوانیی مابوو نە عەترە ســـیحراوییەکەی. ئەو ببووە کیسەی بۆکسێن بۆ کامۆ. دەهات و دەرۆیی دەیدایـــە بـــەر مشـــتەکۆڵەو بۆکـــس. ئەو ســـەری سوڕمابوو، نەیدەزانی بۆ هاوکێشەی ژیان لە ئاست ئەودا وا پێچەوانە کەوتەوە. مەگەر دەکرێ تەمەنی ئەو عەشقە گەورەیە ئەوهەندە کورت بێ.

"کامـــۆ، بـــۆ وات لێهاتـــووە، چـــۆن دڵت دێت ئاوها ئازاری رۆحم بدەی. ســـەیری جەســـتەم کە. شـــوێنێ نەماوە بەر لەقەو بۆکس و زللە و شەقی

تــۆ نەکەوتبێ. مرۆڤی عاشــق ئاوهــا زوو نابێ بە گیانلەبەرێکــی درنــدە. تــۆ بــۆ وا گۆڕاویت؟. بۆ کامۆ". ئەو بە ســاردی وەڵامی دەدایەوە "راســتە ئێمە سەردەمێک عاشقی یەک بووین نێرگز. بەڵام تۆ سنوورەکانت بەزاند. تۆ بە کۆڵێ جوانی ونازو فیــزەوە هاتیتە نێــو ژیانی منێکی لات و هەژار و، ئیدی بەو چاوە ســەیری منت نەدەکرد کە پیاوم. لەم شــارەدا هێشتا سنوور لە نێوان ژن و پیاو دا مــاوە. من لە هەڵبژاردنی تــۆدا هەڵە بووم. وەک دایکــم دەڵێ تۆ پــارووی دەمی مــن نەبووی. ژن دەبێ هەمیشە بستێک لە خوار پیاوەکەیەوە بێت. لــە جوانــی، لە بەژن وبالاً، لە تێگەیشــتوویی، لە خوێندن و شــەهادە، لە قســەکردن، لە هەبوویی، لــە هەڵســووکەوت، لە هەموو شــت. ژن دەبێ لە خوارتر بێت. دەبێ کەمتر بێ.ئا، دەبێ کاتێ قسە لەگەڵ مێردەکەی دەکا، سەر هەڵبڕێ. تۆ لەهەموو ئەوانــە لــە ســەرووی من بــووی. ئەمــە ناکرێ. هەڵەیــە. هەڵەیەکــی زۆر گەورەیە. بەڵام عەشــق سـڕی کردبووم. گێلی کردبووم. تەنها لە شـتێک

له سـه‌رووی من نیت. لـه زۆری بازوو. مه‌چه‌ک و قۆڵ و باسـک و ماسـوولکه‌کانی من له سـه‌رووی هه‌موو جوانی و تێگه‌یشتنه‌کانی تۆوه‌یه. ئه‌مه‌یش، هه‌مـوو ئـه‌و خه‌سـڵه‌تانه‌ی لـه ژن دا هه‌یه و له پیـاودا نیه، ده‌خاته ژێر رکێفه‌وه. ده‌مه‌وێ رۆژانه ئه‌مـه‌ت به‌بیر بێنمه‌وه. تۆ له‌وه‌یـان له خوارتری منی. منیش هه‌ر ئه‌م چه‌که‌م هه‌یه له دژت به‌کاری بێنم تا له ئاسته‌کانی تردا بتهێنمه خوارێ. ناکرێ پۆزم له‌سـه‌ر لێ بده‌یت. من... من هه‌ر ئه‌وه‌نده‌م بـۆ ماوه‌تـه‌وه. رۆژێ به‌لای کـه‌م جارێک به‌بیرت بێنمـه‌وه مێـردی تۆم. له‌سـه‌رووی تـۆم. زیاترم لـه تـۆ. جوانتـر وبالآبه‌رزتـر و خوێنده‌وارترم له تـۆ. ئه‌مه‌ش ته‌نها به لێدان ده‌کـرێ. لێدان تاکه په‌یامێکـه تـا تۆ تێبگـه‌ی له‌م ماڵـه‌دا تۆ ژنی و مـن پیاوم. که‌وابێ من زاڵم به‌سـه‌ر تـۆدا".. ده‌م و چـاوی له ئاوێنه‌که نزیک کـرده‌وه. دوا په‌یامی کامـۆ له‌هه‌مـوو رۆژانی پێشـتر، زه‌قتـرو گۆیاتر به‌سـه‌ر ده‌موچاوییه‌وه دیاربوو. په‌ڵه‌یه‌کی پان و پۆرو شـین و مۆری ژێر چـاوی چه‌په‌ی، دیمه‌نی

روخساری شــێواندبوو. تەنانەت خوێن تێ زابووە نێو چاوی چەپەی و کردبووی بە گۆمێکی سوور. لای راستەی لێوی سەرەوەی بە تەرزێکی ناشیرین پەڵمابــوو. ئــەوێ زۆر ئــازاری دەدا. ئەو کاتەیش هەســتی بە ئازارێکی زۆر کــرد کاتێ لێوی کەوتە نێوان ددانەکانی و مستە رەقەکەی کامۆ. "چیبکەم. دەبێ چیبکەم...." نەیزانی. هات و چوو. دانیشت. هەســتایەوە. رۆیی. راوەســتا و نەیزانی چی بکا. چاوەکانی کەوتە ســەر عەباکــەی. لە ماوەی ئەو یەک ســاڵەی لای کامۆ بوو، هێشــتا بــە تەواوی فێر نەببو چۆن وەکو دایک و خوشــکەکانی کامۆ، بەیەک جووڵەی خێرا عەباکە لەســەر لەچکەکەی ســەری جێگیر بــکات. دڵنیا نەبوو لــەو بڕیارەی خێــرا خێرا دەکەوتە ناو مێشــکی و، دڵی ڕێگەی جێبەجێکردنەکــەی نەدەدا. بەڵام دواجار هەر وای کــرد. لەچکەکەی توند وموکوم بەدەوری ســەری داپێچاو عەباکەی خســتە ســەر ســەری و لە ماڵ دەرچوو. قســە ئازاردەرەکانی کامۆ هێشــتا وەک مێروولــە کەوتبوونــە وێزەی جەســتەی، خورێکی

ناخۆش پێستی لەشی داگرتبوو. ئاوڕێکی دواوەی دایەوە، سەیری درزی بن دەرگای حەوشەی کرد. دەتگوت قسەکانی کامۆ، وەکو ریزە مێروولەیەک رێچکەیان بەستووە و بەدوای دادێن، بە کەلێنی پەنجەکانی پێی دا بەرەو هەورازی لەشی هەڵدەکشێن ودەچن لەنێو قژە ئاڵۆسکاوەکەی سەری تێک دەچرژێن و مل لێک دەنێن و پاشان دەرژێنە نێو کاسەی سەری. هەنگاوەکانی خێراتر هەڵهێنا. سواری ئەو پاسە بوو کە لەسەر هێڵی "زەلکاو - ٢١" هاتووچۆی دەکرد. بە لەچکی عەباکەی دەم و چاوی پۆشاندبوو. هەرجارێ پەنجە گرژبووەکانی دەکەوتە سەر پەڵە شین ومۆرەکەی ژێر چاوی لای چەپەی، یان گۆشەی لای راستەی لێوی، تەزووی ئازارێک تا ناو ئێسقانەکانی دزەیان دەکرد. لەبەر دەرگای ماڵی باوکی راوەستا، هێشتا دوودڵ و بە گومان بوو. تۆپەڵی گریانێکی قووڵ لە ناوەڕاستی قورگی گیری کردبوو.

نە دەتەقییەوە و نە خاو دەبۆوە و شۆڕدەبۆوە خوارێ. پەنجەی دەلەرزی کاتێ نایە سەر

دوگمـــەی زەنگەکە. دایکـــی دەرگای کردەوە. هەر ئەوەنـــدە خۆی فڕێدایە باوەشـــی دایکـــی تۆپەڵە گریانەکـــە تەقییەوە و بارانی فرمێســـکی داباریـن. لـــە حەژمەتی ئـــازارە دەروونی و جەســـتەییەکانی و، لـــەو درزەی، لە دەرەنجامی پاشـــگەزبوونەوەی "کامـــۆ" لـــە خۆشەویســـتی و مایەپووچبوونـــی هاوســـەرییەکەی و، لەتاو ئەو شـــەرمە و ترســـەی لـــە رووبەڕووبوونەوەی باوکیـــدا چاوەڕێی دەکرد، لـــە نێو باوەشـــی تـــرس داگرتووی دایکـــی، وەکو دوا پەلکوتانەکانی ماســـییەک کەوتبێتە نێو تۆڕی ماســـیگرێکی بـــێ بەزەییـــەوە، هەنســـکی دەدا. پێویست نەبوو هیچ بڵێ. دایکی هەموو شتێکی لە دەم و چاوی کچەکەی خوێندەوە. باوکی بۆ نوێژی نیوەڕۆ چووبووە مزگەوت. دەرفەتێک بوو تا دەردی پەنگخواردووی نێو دڵی بۆ دایکی هەڵبڕێژێ. کاتێ باوکی هاتەوە سەیری دەم و چاوی کچەکەی کرد، بەخێرهاتنـــەوەی نەکرد. چونکـــە دەیزانی بەخێر نەهاتۆتـــەوە. ئەویش وەکو هەمـــوو پیاوێکی ئەم شـــارە لێدانی ژنی بە پاساوێکی گونجاو نەدەزانی

بۆ ڕۆیشــتن و زیز بوونی ژن. دەم و چاوی تێکنا. سـەرێکی بـاداو تەنهـا گوتی "لا حەولــە وەلا..." و، سـەری خۆی بەردایەوە وچـووە ژووری خۆی. دایکـی دەیزانـی لـە کاتـی وادا دەبـێ بچێتە بن پاڵـی مێردەکەی و هەندێ بـە پاڕانەوە و هەندێ پیاهەڵـدان، پیاوەکەی لە ماجەرا تێبگەیەنێ و لە هەڵچوون خاوی بکاتەوە. نێرگز لە پشت دەرگاکەوە گوێبیسـتی ئاخاوتنەکانیان دەبوو. ڕاسـتە باوکی ڕووی دەمی لە خێزانە بەستەزمانەکەی بوو. بەڵام پەیامەکەی بۆ نێرگز بوو. هەر بۆیە بە ئانقەسـت دەنگی هەڵدەبڕی تا کچەکەی گوێی لێ بێ ولەوە بگا باوکی زۆر تورەیە و نا قایلە بە هاتنەوەی بەم شێوەیە و قبوڵی نیە بە زیز بوویی لە ماڵی ئەودا بمێنێتـەوە. دڵی گوشـرا. هەسـتایەوە عەباکەی نایەوە سەری و لە ماڵ دەرچوو. بێ هیچ ئامانجێک ماوەیەک لە شـەقامەکاندا دەسـووڕایەوە. بێچارە ببـوو. سـەرگەردان و وێـڵ بـەدوای پەناگەیەکدا دەگەڕا هیچ شـوێنێکی شک نەدەبرد. دڵی لە نێو زیندانی سـنگی دا وەکو تۆپەڵە قوڕێکی خەستی

لێهاتبوو. ڕێگەی هەناسەی تا دەهات بەرتەسکتر دەبۆوە. گەڕایەوە ماڵی باوکی، لە زەنگی دا. دایکی دەرگای کردەوە. پەڵەیەکی شین و مۆری لە ژێر چاوی چەپەی دایکی بەدی کرد و گۆشەی لای ڕاستەی لێوی سەرەوەیشی هێشتا خوێنی لێ دەتکا. دەتگوت لە بەرامبەر ئاوێنە لێڵەکەی ماڵە سارد و سڕەکەی خۆیدا وەستاوە و سەیری خۆی دەکات بە پیری. هەردووکیان سەریان بەردایەوە. نێرگز بێ ئەوەی هیچ بڵێ پشتی لە دایکی کرد و گەڕایەوە سەری شەقام. سواری ئەو پاسە بوو کە لەسەر هێڵی "٢١ ـ زەلکاو" هاتوچۆی دەکرد. هەستی مردوویەکی هەبوو لە نێو دارمەیتێکدایە و بەرەو گۆڕستانی دەبەن.

تەڵەپووش ئاسا خۆت سپاردووە بەدەم بایەکی سەرشـێت، کە هەردەم وسات بەرەو لایەکت دەبا.
"دەبـێ دیواری ئەقڵم درزی تێکەوتبێ"؟! هەسـت دەکەی ئەو کێشـەت نەماوە زەوی لەسـەر پشتی خۆی راتگرێ. مایەپوچبوون لە هەوڵێکی نەخۆش بۆ خۆشویسـتن چەپۆکی خستۆتە ناختەوە و لە دەروونتدا هەڵتدەکۆڵێ.
"ئەو یەک ساڵەی بەسـەر تەمەنمـدا بووری، دەبـێ سـەرەتایەک بووبـێ بـۆ شـێت بوونم"؟! توێکڵێکی رەش لە گومان و نا ئومێدی بەرچاوتی لێڵ و تاریک کردووە. دەڵێی دنیا لەناو چاوەکانی

تۆدا بۆتە شەوێکی یەکجارەکی. "ساڵێک. ساڵێکی ڕەبەق خۆشیم ویست بێ ئەوەی بزانم ناوی چییە"!

لەناو پارکی شار، لەسەر چیمەنە سەوزەکەدا، کە تۆسقاڵێک ڕۆشنایی ژیانی دەگەڕاندەوە ناو دڵت، دانیشتی "ساڵێکی تەواو بەهەموو ڕۆژ و شەوەکانیەوە، بەهەموو چرکە ساتەکانییەوە خۆشمویست بێ ئەوەی بزانم ئەو چ هەستێکی بەرامبەر بەمن هەیە"؟!

هەستایتەوە. بەرەو دەرگا ڕۆیشتی تا لە پارکەکە بچیتە دەرەوە. بەر لەوەی هەنگاوی دەرچوونت ئاودیوکەی گەڕایتەوە "بەو گێژییەی من تێی کەوتووم بۆ کوێ بڕۆم"؟! وەک کۆنە دیوارێک لە بناغەوە بنکۆڵ کرابێ بەسەر خۆتدا داڕمای. تەپ و تۆزی ڕووداوەکە خەریک بوو ئەتیخنکاند. دەمێکە تێگەیشتووی نەریتە بۆ ماوەکانی سەدان و هەزاران ساڵ پێش، وەکو جاڵجاڵۆکە، تەونێکی چڕی بەدەوری مێشک و دڵ و هەموو هەستەکانی مرۆڤی دەورووبەرتدا تەنیوە. ڕووداوەکە لە ناوەوە وڕ و کاسی کردبوویت. لە دەرەوەیشدا دەتگوت

لەناو بازنەیەکی داخــراودا گیرت خواردووە و هەر بــە دەوری خۆتدا دەســوڕێیتەوە. بێ ئەوەی درز وکەلەبەرێــک بــەدی بکەی بۆ دەرچوون. لەســەر چیمەنــە گەشــەکەدا، بەســەر تیراقەی پشــتتدا راکشــایت. لــە لووتەوە پڕ بە ســییەکانت هەوات هەڵمژی. فێنکاییەکی ئارامبەخش لە بڕبڕە و پێستی پشــتتەوە هەڵکشایە ناو کاسەی سەرت کە ببووە چاڵێــک لە ئاگر. حەزت لێبــوو لەناو چیمەنەکەدا خــۆت بگەوزێنی. ئەوەندە تل بخۆیتــەوە تا دنیا کۆتایی دێت "ســاڵێک لــە چاوەکانی ئەوەوە _کە قەت نەمتوانی هیچ شــتێکیان تێــدا بخوێنمەوە_ دنیــام جۆرێکیتــر دەبینــی". قیــت بوویتــەوە. ئەژنۆکانت توند لە ئامێز گوشی و چەناگەت خستە بانیانــەوە. هەر ئەوها کە بوویت، ئەژنۆ لە ئامێز، ئــارام و لەســەرەخۆ، جارێــک بــە دەوری خۆتدا ســووڕایت، بەنیگا سەرنجی هەموو ناو پارکەکەت دا، تەنها لە ئاســت ئەو کچەدا، کە دوورتر لە تۆ، لەسەر کورسییەکی چیمەنتۆییدا، ئەژنۆکانی، وەک تــۆ، گرتبووە باوەشــی و خۆی گرمۆڵــە کردبوو،

هەڵوەستەیەکی کورتت کرد "خۆشەویستی لەم دەڤەرەی ئێمە تەنها کارێکە، هەمووان کۆکن لەسەر یاساغکردنی". دوێنێ، بەسەر شریتێکی جووڵاوی سەر شاشەی تەلەفزیۆنێکی فەتوادەر دا بە بەرچاوانتدا گوزەرا : خۆشەویستی نێوان کچ و کوڕ حەرامە. حەرامە. حەرامە.. لە پڕێکا چاوەکانت دەرپۆقین، کچە گرمۆڵە بووەکەی سەر کورسییە چیمەنتۆییەکە، بوو بە دەیان و سەدان و هەزاران پەیکەر و هەموو پانتاییە سەوزەکەی ناو پارکەکەیان داگیرکرد. گوڵ و گیاکان وتاڵ تاڵی چیمەنەکەیشیان پلیشاندەوە، رووت بە هەرلایەکدا وەرسووڕاند، چوارچێوەی نیگات پڕ بوو لە پەیکەری کچە ئەژنۆ لە ئامێز و گرمۆڵە بووەکەی سەر کورسییە چیمەنتۆییەکە. پێڵووی چاوەکانت خێرا داخست. تەنها ئەو پیرەمێردە لەڕ و لاوازە دزەی کردە ناوەوەی چاوەکانت کە هەموو بەیانیان سەرە خڕ و بچکۆلانەکەی بەسەر ملە باریک و چرچەکەیدا دەلەقاندەوە. لە ترسا بوو، یان لە رقی ئەستوورت، بۆ وەدەرنانی پیرەمێردەکە، خێرا

چاوەکانت کردەوە "گومانم نەما ئەوە یەک ساڵە من شێت بوومە"! نەنکت لەم دواییانەدا کە تۆی شــپرزە دەبینی بە شێوەیەکی ترسناک پێدەکەنی و دەیگوت "کورم خۆشەویستی لای ئێمە شێتییە، شێتی. تۆ خۆت شێت مەکە. لە وڵاتێکدا کە هەموو ئامادەن بۆ کوشــتنی یەکتر چ پێویســتییەکت بە خۆشەویستی هەیە؟ ئێمە عەیامێکی دوورە، ئیدی دەرگای خۆشەویســتیمان داخستووە کورم. کچی خەڵکیش بە کوشــت مەدە". نەنکت دەمێکە بۆتە بەشــێک لە لادیوارێکی ژوورە نیمچە تاریک و بۆن خەســتەکەی. نەتزانی ئــەو ئەزموونەی لە کوێوە وەرگرتــووە "دەبــێ پەیوەندییەکــی نهێنی لەگەڵ دنیای دەرەوەی ژوورەکەیدا هەبێ"؟ ســەرت وەک زەبەشــێکی خڕ لەناو هەردوو لەپی دەســتەکانتدا گوشی. ئەوەندە گوشیت هەتا گوێت لە قرچەی بوو.

"دەشــێ ئەو ئامۆژگارییەی نەنکم جۆرێک بێ لە فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی. بۆیە من هیچی لێ حاڵی نەبــووم! ئاخر من کە کچێکم خۆشویســت ئیدی بۆ دەبێ بە کوشتنی بدەم". دوێنێ بوو لەسەر

لاپەڕەیەکی گۆڤارێکدا خوێندتەوە

"ئاماری ئەو ئافرەتانەی تەنها لە یەک ساڵی رابردوو، لە شارەکەماندا خۆیان سوتاند گەیشتە سێسەد و شەست و پێنج کەس، زۆربەیان کچ بوون و زۆریان لە یەکەم شەوی بوکێنی...".

لەولاتر، دوورتر لە تۆ، کچە ئەژنۆ لە ئامێز و گرمۆڵە بووەکە، هێشتا لەسەر کورسییە چیمەنتۆییەکەدا نەجولابوو. لەم دواییەدا مامۆستایەک گوتی: "مرۆڤایەتی ماوەیەک لە لووتکە وەستا. ئێستاش کەوتۆتە لێژایی و نشێو دەبێتەوە بەرەو گەڕانەوە بۆ قۆناغەکانی سەرەتای خەلیقەت. ئەگەر ورد سەرنجی رووداوەکانی دەورووبەری خۆمان بدەین دەقاودەق هەڵسوکەوتی سەردەمی نەفامیمان پێوە دیارە". قوتابییەک لە مامۆستاکەی پرسی "ئێمەش لەگەڵ مرۆڤایەتیدا گەیشتینە لوتکە"؟ مامۆستاکە گوتی: "نا کوڕم، ئێمە لە هەرە خوارەوە مابووینەوە. چونکە دەمانزانی ئەوان هەر دەبێ بگەڕێنەوە. بۆیە بە پێویستمان نەزانی خۆمان ماندوو بکەین"!.

هەمــان قوتابی گوتی: "بەڵام ئێمــە نابینە پێوەر بۆ سەرجەم کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکان. ئەگەر لای ئێمە رۆژانە ئاگر لە رۆح و جەستەی خۆشەویستی بــەردەدەن، خەڵکانێــک هــەن بانگەشــەی خۆشەویســتی و میهرەبانی دەکــەن". هەر دوێنێ بوو لــە گۆڤارەکەدا خوێندتەوە "لاوێکی مریشــک فرۆش بەهەمان چەقۆی مریشک کوشتنەوەکەیدا، ژنەکــەی خۆی ئەنجن ئەنجن کــرد و دواتریش بە ســادەیی کوشتنەوەی مریشــکێک، سەری گۆشاو گۆش بڕی". باوکت، شــەو کە هەواڵەکەی بیســت گوتی "دیارە ژنەکە قەباحەتێکی کردووە!. ئێمەیش کۆمەڵگەیەکــی رۆژهەڵاتین کورم. لای ئێمە تەنها خوێــن قەباحەتی ژن دەشــواتەوە"! ماوەیەک بوو ئاگاداری پەیوەندییە نهێنییەکەی خوشکت و کوڕە دراوسێکەتان بوویت. بۆیە بە ئەسپایی ئاوڕێکی لای خوشکە بەســتە زمانەکەشت دایەوە کە دەتگوت، پەیکەرێکە لە ترس و چیمەنتۆ دارێژراوە. نیگاتان لەســەر روخسارە ساردوسرەکەی باوکت دا وەستا و لەنــاو داوە تێــک ئاڵاوەکانــی ردێنیــدا ون بوو.

وەک هەموو ڕۆژانی پێشوو ئەو بەیانییەش، بەرەو ساباتەکە کەوتیتە ڕێ. هەموو ڕۆژ بەر لەخۆت دوو پیاو دەگەیشــتنە ژێر ســاباتەکەوە لە چاوەڕوانی پاسدا دەوەســتان. کەچی بەیانییەکەی ئەو ڕۆژە جیــاواز بــوو. بێجگە لــە دوو پیاوەکە، کچێکیش لەولاتریان وەســتابوو. جوانییەکەی سرِی کردیت. ڕێک ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆی ســالێک لەمەوبەر بوو. بــە درێژایــی ئــەو ڕۆژە، ئاوێنــەی چاوەکانت لەو زیاتر، وێنەی هیچ کەســێکی تریان وەرنەگرت. تا شــەو داهات و خزایتە نێو خەلوەتێکی ئاشقانە و بۆیت نووسی:

"دەڵێــن خۆشەویســتی ڕاســتەقینە مــرۆڤ لەناخــەوە دەهەژێنــێ. بــەلام من ئــەم بەیانییە نەک هەر هەژام، ســەراوبن بووم. هەڵتەکام. تەپ وتۆزێکی یەکجار زۆر لەسەر ڕۆحم داتەکا. هەست دەکــەم زولاڵ بوومەتــەوە.. وەک ڕۆژانی منداڵیم. دەکرێ ئەمە سەرەتایەک بێ بۆ خۆشەویستی"؟..

بەیانییەکــەی ڕۆژی دووەم، بێجگــە لە ترپەی دڵــت، هەمــوو دەنگــەکان لەنــاو گوێچکەکانتــدا

کوژابوونــەوە. نامەکە لەنــاو گیرفانت دا دەتگوت بۆمبێکــە و چرکــە بە چرکە لــە تەقینەوە نزیکتر دەبێتــەوە. بۆ ســاتێک، نیــگات لەســەر کچەکە لاکەوت، بێ ویســتی خۆت، ئاراســتەی نیگات لە شەقامەکە پەڕییەوە ئەوبەر و لە پشت جامەکانی پەنجەرەی ماڵێکــەوە، پیرەمێردێکی لەڕ و لاوازت بینــی، ســەرە خــڕ و بچکۆلانەکەی بەســەر ملە باریــک وچرچەکەیــدا لەقەلەقی بــوو. نەتزانی بۆ بــە بینینی ئەو پیرەمێردە حەپەســایت. تەنانەت هەســتت کرد نــاو قوڕگت لە وشــکێتیدا شــەقار شــەقار بوو. نامەکەت کردە ســەدان پارچە و لە پەنجــەرە کراوەکەی پاســەکەوە ســپاردت بەدەم بــادا. هەموو ڕۆژەکانــت بە یادی ئەو بەڕێ دەکرد و هەموو شەوان دەخزایتە خەڵوەتەکەی جارانت و بــەر لە خەوتنت نامەیەکت دەئاخنیە گیرفانتەوە. هەموو بەیانییەکیش، بێ ویستی خۆت نیگات وەک منداڵێکی بزۆز خۆی رادەپســکاند و لە شەقامەکە ئاودیــو دەبوو. هەمان ســەرە خڕ و بچکۆلانەکەی پیرەمێــردە لەڕ و لاوازەکەت دەبینی بەســەر ملە

باریک وچرچەکەیدا، وەک پاندۆلّی سەعاتێکی کۆن و ماندوو بەســەر لا دیوارێکی بەردین دا لەقەلەقی بــوو. هەر چوار وەرزەکە هاتن و رۆیشــتن تۆ لەو کچــە زیاتر، کە بە یەکەم زەنگی خۆشەویســتی، دڵــی نوســتووتی لــە خەوێکــی مــردن ئاســادا، راچڵەکاندبوو، کەسێکت نەدەبینی. ئەویش هەموو بەیانییــەک لە هەمان شــوێنی خۆی دەوەســتا و دەتگوت پێچکەیەکی ساباتەکەیە و لەناو تۆپەڵێک چیمەنتــۆدا چەقاندوویانــە. هیــچ جووڵەیەکــی لــێ بەدی نەدەکــرا و هیــچ کاتێک ئەوەنــدە ناو چاوەکانیت نەبینی شــتێکیان تێــدا بخوێنیتەوە. پیرەمێردە لەڕ ولاوازەکەی پشت پەنجەرەی ئەودیو شــەقامەکەیش، وەک قورمیــش کرابــێ، هەمــوو بەیانییەک، بێ ئەوەی رۆژێک دوابکەوێ، سەرە خڕ و بچکۆڵانەکەی لەســەر ملــە باریک و چرچەکەیدا بەمــلاو ئــەولادا دەلەقانــد ودەیویســت پێت بڵێ "نەکەی. نامەکەت بســپێرە بەدەست باوە باشترە لەوەی بیدەیتە ئەو" چەند جارێک پێت هەڵگرت لە شــەقامەکە بپەڕیتەوە و سەرەخڕ و بچکۆڵانەکەی

ئەوەندە بەســەر ملە باریک و چرچەکەیدا بادەیت تا لە هەوکەوە بیقرتێنی" خەریکە شـێتم دەکات". گەڕایتــەوە ناو پارکی شــار. چاوت هەڵبڕی، کچە ئەژنۆ لە ئامێز وکرمۆڵە بووەکەی ســەر کورسییە چیمەنتۆییەکــە هەروەک خۆی بێ جووڵە مابۆوە. ئەنکت دەیگوت "ئێمە لەگەڵ شــەڕ و شۆڕ گەورە بووینە رۆڵە. ئێســتاش لە ئاگر و شمشێر بترازێ زمانێکی تر بۆ خۆشەویســتی نازانین. زەمەنێکی درێژە کانیاوی خۆشەویســتیمان وشــکی کردووە. دەســتی قودرەتێکــی نادیــار وەجووڵەمان دەخا. ئەگینــا رۆحمان تیا نەماوە. لەگــەڵ یەکەم تەقە کە خۆمانی پێکا، لە هەموو هەســتێک داچۆڕاین". لەگەڵ ئەوەشــدا ئەنکت هێشــتا ناونیشانی وڵاتی خۆشەویســتی لەیــاد مابــوو. "ئەودیــوی شــەڕ، خۆشەویســتییە". تۆش ســەرت دەکێشا بە کۆنە دیوارەکــەی ژووری ئەنکــت "جا ئێمە کەی ئاودیو دەبیــن؟ تۆ بڵێی رۆژێک بێ ئاودیو بین. بڵێی؟". ئەویش هەناســەیەکی هەڵدەکێشا و دەیگوت "هەر تەنهــا شــەقاوێکە کــورم. یەک شــەقاو، بەڵام بۆ

هەڵهێنانی ئەو شەقاوە یەکەمجار دەبێ پێمان لەنێو ئەو ئەقڵە چیمەنتۆییە رزگار بکەین". شەوی رابردوو، سەیرێکی یادداشتەکانت کرد "چ زوو ساڵێک بۆری. ساڵێک بێ ئەوەی هیچ لە ساتەکانیدا بخوێنمەوە. هیچ. هیچ". لە بن ساباتەکەدا لێوەکانت بەسەر یەکدا دەگوشین و ددانەکانت جیڕ کردبۆوە. نیگات بۆ ئەودیو شەقامەکە رادەپسکا. بۆت نەدەهاتەوە. سەری پیرەمێردەکە دەتگوت پاندۆڵی سەعاتێکەو سەراوژێر بە دیوارەوە هەڵواسراوە. پاسەکە گەیشت. لەدوای ساڵێک ئەو جورئەتەت تیا سەوز بوو، بتوانی لە کورسییەکەی تەنیشت کچەکەوە دانیشی. کارمەندێکی پاسەکە هات ویەکەو بلیتێکی دایە دەستتان. نامەکەت لە گیرفانت دەرهێنا. وەک یەکەم و دوا نامە، لەسەر لەتە کاغەزێکی یەکجار بچووک دا نوسیبووت. "داوای چارەنووسێک دەکەم بۆ خۆشەویستییەکەم. تکایە".. قسەکانی نەنکت خەریک بوو، لە دوا ساتەکانت دا پاشەکشەت پێ بکا "خاکی ئەم دەڤەرە، پێز و پیتی جارانی نەماوە کوڕم. گەردەلوولێکی ناحەزچی لمە سووتاوەکەی

بیابانە هەڵقرچاوەکانی ئەولا بوو هێنای و پژاندی بەسەر خاکە بە پێزەکەی ئەم دەڤەرە پڕ لە جوانی و هەمیشە سەوزەدا و ئیدی نەیهێشت تۆوی خۆشەویستی سەر دەربێنێ، رۆڵە.. لەملایشەوە لەبەر درک ودالّی شەڕ، چیدی تۆوی خۆشەویستی لێ شین نابێ" . دەستت دەلەرزی کە نامەکەت بۆی درێژ کرد. بەلاتەوە سەیر بوو. بێ هیچ کاردانەوە و سەرسوڕمانێک نامەکەی زۆر بە ئاسایی وەرگرت. وەک ئەوەی زەمەنێک بێ چاوەڕێی شتێکی ئاوها بکات. لوولی نامەکەی کردەوە و هەر بە چاو خوێندییەوە و، هەر لەسەرەخۆ لوولی دایەوە و نیگای لە پەنجەرەی پاسەکەوە پاشییە دەرەوە "ئەو کچە دەڵێی تەنها جەستەیە و رۆحی تێدا نییە". ئەوجا گەیشتیە قەناعەتێک "نەنکم برێکی باش لە فەلسەفە دەزانێ"! . وەک هەموو رۆژ، وێستگەیەک بەرلە تۆ دابەزی، نیگات، دەتگوت بۆتە لاستیک و پێیەوە نووساوە، لە پەنجەرە کراوەکەی پاسەکەوە ببنیت هەر کە دابەزی. کاغەزێکی ورد کراوی سپارد بەدەم بایەکەوە.

نەتزانی نامەکەی تۆ بوو، یان بلیتی پاسـەکە بـوو. درەنگی شـەوی رابردوو نەنکـت مرد. ئەم بەیانییەش کچەکەت لەژێر ساباتەکەدا نەبینییەوە. لەوبەر شەقامەکەش نە پەنجەرەیەکت بەدی کرد و نە پیرەمێردێکیش سەری بۆ دەلەقاندی "بەڵێ. من لە رۆژێکی وەک ئەمڕۆی پارساڵەوە شێت بوومە"!. هەستایتەوە. پارکەکە چۆڵ بوو. بەرەو کچە ئەژنۆ لـە ئامێـز و گرمۆڵە بووەکە چوویت، کە هێشـتا لەسەر کورسییە چیمەنتۆییەکەدا بێ جووڵە مابوو. لێی نزیک کەوتیتەوە، جارێک بە دەوریدا سوڕایت. ورد تێـی رامایت. کچەکە مرۆڤێکی زیندوو نەبوو. ئەو وەک بەشێک لە کورسییەکە، پەیکەرێکی ئەژنۆ لە ئامێـز و گرمۆڵە بووی چیمەنتۆیی بوو. کە لە پارکەکە دەرچوویت هێشتا بیرت لە ناونیشانی ئەو دەڤـەرە دەکردەوە، کە نەنکت بەر لە مردنی پێی دایت "ئەودیوی شەڕ.. خۆشەویستیە".

• چاوەکانم.. •
لە جووتێ پێڵاو دەچن

نــە تێپەڕبوونی زەمــەن و نە گوزەری تەمەن، هیچکامیــان بــەلای ئــەوەوە مانایەکیــان نەبوو. قەدەری ئەو، کتێبێکی کۆنە و نووســراوەتەوە. نە بۆی هەیە رازی نەبێ بەو قەدەرە و نە بۆی هەیە بیگۆڕێ. هەموو ژیانی لە رادەســتبوونی ئەو، بەو قــەدەرە دیاری کراوە. بەیانیان، لە مەودای نێوان خەوزڕانەکــەی دەمــەو بەیانیانی تــا خۆرهەڵات، ژوانێکــی بەردەوام و نەبڕاوەی هەیە لەگەڵ ئاوێنە کــۆن وتەڵخەکــەی ژوورەکــەی و لەنێویــدا، بــە سەرســامییەوە لە جوانیی خــۆی رادەمێنێ. قەت لــە بیری نایێ، رۆژێک لــەو ژوانە دواکەوتبێ، یان

بێزار بووبێ. لەم دواییانە لێی تێکچووە. جێیەکانی خۆی و "ئەو"ی ناو ئاوێنەکەی لێ گۆڕاوە. ئێستا کە لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا رادەوەستێ نازانێ ئەوەی ناو ئاوێنەکە "ئەو"ی راستییە یان ئەوەی لە دەرەوەی ئاوێنەکەدایە. هەندێجار وادەزانێت "ئەو" لە دەرەوەی ئاوێنەکەدا بوونی نیە. تەنها "ئەو"ی بێ رۆحە لەناو ئاوێنەکەدا. زۆر جاران ترسێکی سەیر و وەحشەتێکی کوشندە دایدەگرێ کاتێ گومان لە بوونی خۆی دەکات لە دەرەوەی ئاوێنەکەدا. سەرپەنجەکانی بەسەر روخسار و روومەتەکانی دادێنێ و هەستیان پێ ناکات. دەڵێی دەست بە هەوا دا دێنێت. یان بە هەڵمێکی سووک. یان بە تارمایی. گریانێکی پڕ لە ترس لە دەروونی دا پەنگ دەداتەوە. نە دەبێتە فرمێسک و نە دەبێتە هەنسک. هەر لەناو قورگی دا قوڵپ دەداتەوە و ناتەقێتەوە. هەندێجاریش وادەزانێ تەنها جەستە و رواڵەتە. وەکو پێستێک پڕ لە با کرابێ. ناو سەری و ناو هەموو جەستەی پڕە لە هەوایەکی پەنگ خواردووی قورس. بەتاڵە لە

حەز و بیر. خاڵییە لە رۆح وهەست. پووچەڵە لە زیندوویتی. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لە ژوانەکەی دوا ناکەوێ. دەڵێی بۆتە بەشێکی نەگۆڕ لە ژیانی، ئەو ژیانەی بە لای ئەو، تەنها وشەیەکی بێ مانایە و هیچیتر. یان مانایەکی بێ تەفسیرە. یانیش تەفسیرێکە لە مەرگێکی زیندوو. ئەو لەگەڵ "ئەو"ی ناو ئاوێنەکەدا بۆتە هاوڕێ. هەموو رۆژ لە مەودای نێوان خەوزڕانەکەی دەمە و بەیانیانی تا خۆرهەڵات پێکەوە ژوان دەبەستن. بە یەکەوە قسە دەکەن. نهێنیترین رازەکانیان بۆ یەکدی دەدرکێنن. قاچاغترین جووڵە و بزاوت بە جەستەکانیان دەکەن و یاساغترین وشەکان پێکەوە ئاڵوگۆڕ دەکەن. دنیای ئەوان هێندەی ئاوێنەیەکی نیو مەتریی کۆن و تەڵخ، بەرین و گەورە بوو. تێیدا ختۆکەی هەستەکانی یەکتریان دەدا. تەنانەت پەنجەیان بەسەر لاڕوومەتەکان و مل و سنگ و لێوەکانی یەکتر دادەخشاند. بەڵام نە هەستەکانیان لە خەوی گران هەڵدەستا و نە مانایەکیان بۆ چێژ دەدۆزییەوە. ئەوان لەناو ئاوێنەکەدا تەنانەت

زاتــی ئەوەیان دەکــرد بە تریقە وئــاواز پێبکەنن و، هەمیشــە لــە دوا دیمەنــی ژوانەکەشــیاندا، بە دەنــگ، دەگریان. پێکەوە دەگریان و فرمێســکی یەکتریان دەســڕییەوە. ئەوجا ئەو، جوانیی خۆی لەناو ئاوێنەکەدا جێدەهێشت و دەکەوتە پۆشینی جلەکانی. بەر لەوەیش لەماڵ دەرچێ، دەبوایە وەک تارماییەکی رەش، لەبەرامبەر باوکی دا بوەســتێ تا ئەویش، وەک چۆن فەرماندەیەکی وشــکرەفتار و دڵرەق، ســەربازەکانی خۆی، لە پۆســتاڵەوە تا کڵاوەکــەی ســەریان دەپشــکنێ، لە گــۆرەوی تا لەچکەکانی سەری بپشکنێ مەبادا داوێک لە قژی لە درزێکی سەرپۆشــەکەی، یان ســەرپەنجەیەکی دەســتی لە کونێکــی پەنجەوانەکەی، یان نینۆکی پێی لە کەلێنی دڕاوی گۆرەوییەکەی دەرچووبێ و ئەوی پێ گوناحبار بێ. ئەگەرچی ئەو پشــکنینە تەنهــا چەند چرکەیەکی دەخایانــد بەڵام هێندەی درێژایی ساڵێک بەســەر ئەودا تێدەپەڕی. باوکی، کاتێ چاوەکانی زەق دەکردەوە بۆپشــکنینی، ئەو وای دەزانی ســەرقەپاخی لەسەر هێلانەی مێروولە

لاداوه و لــه چەنــد چرکەیەکدا هــەزاران مێرووله بەسەر رووتەی پێستیدا ڕێ دەکەن و هەندێجار دزه دەکەنه ژێر پێستی و، دەمارەکانیشی کون دەکەن و تێکەڵ بە خوێنی دەبن. بەڵام ئەو دەم و چاوی گــرژ نەدەکرد. ئەوەی وەکو مافێکی ڕەوای باوکی دەزانی. بە ڕێزەوە خۆی رادەســتی بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکە دەکــرد لەلایەن باوکییەوە. لە دەرگای حەوشە، کە ئاودیو دەبوو بۆ دەرەوە، وەکو شێت دەکەوتە وێزەی خــۆی. بەهەموو هێزییەوە عەباو مانتۆکەی و چەفیەکانی ســەری دەتەکاند. کاتێک هەســتی دەکــرد مێروولەکانی نیــگای باوکی لێی تەکاون، ســەری خــۆی بەردەدایــەوە و دەڕۆیی. بــەڵام دەنگــی باوکــی لەنــاو کاســەی ســەریدا، وەک ریکۆردەرێکی شــەکەت، دەنگــی دەدایەوە: "دەرگاکانــی دۆزەخــم لــێ مەکــەرەوە کچەکەم. جەســتەی ئافرەت داوێکە پیاوان پەلکێشی گوناه دەکات. باری تەعالا ویستی، بە خولْقاندنی ئێوە، ئیــرادەو خۆڕاگری ئێمەی پیــاوان تاقی بکاتەوە. داوێک لە قژی ســەرتان، قامک و پەنجەی دەست

و پێیتـــان، نیگای تیژ و چاوی جوانتان، ســیحری نیگاو عەتری هەناسەتان، ریتمی رۆیشتن و لەرەی سـنگتان، تریقەی پێکەنین و مۆسیقای گریانتان، ئــاوازی هەنســک و جــادووی مەکرتــان، تەڕایی هەنگوێنی ســەر لێوەکانتان، ســەمای جەســتە و لەرەی دەنگتان... ســـەر تا پێتان هەمووی رێگایە بــەرەو گوناه و فەنابوون و تونێلێکە بەرەو دۆزەخ ئێمەتان پێ تاقــی دەکرێینەوە. تۆ وامەکە ببیتە تەڵەیــەک بۆ راکێشــانی پیــاوان بــەرەو دۆزەخ. تــۆ وامەکە ببیتــە خــودی دۆزەخ و، پیاوان، ئەو مەخلوقــە بێچارانەت تێدا هەڵقرچێن. جەســتە و جوانیــت زیندانــی بکەو هەســت و دڵت کپ کە و چاوان هەڵمەبڕە. هەر گەنجێک بەرەو داوی گوناه رابکێشــی، دەرگایەک لــە دەرگاکانی دۆزەخت بە رووی من دا کردۆتەوە. وام لەگەڵ مەکە کچەکەم. خــۆت و منیــش بپارێــزە لــەو ئاگرە ســامناک و سوتێنەرەی نە سەری دیارە و نە بنی. من باوکتم. تــۆم پەروەردە کردووە. هەقم بەســەرتەوە هەیە. ئــەم دنیا هیچە، کــە تەمەنی مەخلووق تێیدا هەر

هێندەی تروکاندنێکــی پێڵووەکانی چاوێکە، بۆتە جەنگەڵستانێک پڕێتی لە گورگی کەڵبە تیژ و چاو ســوور و تینووی گوناە و برسی شەهوەت. دەبێ چاومان لە ئاســت هەمــوو جوانییەکان بنووقێنین و نەوســمان لە ئاســت هەموو چێژە دنیاییەکاندا کــپ بکەین تا لــەم گورگســتانە رزگارمان دەبێ. هەمووی چەند ســاڵێکە. چاو نوقانێکە کچەکەم. مەگــەر نەتبیســتووە دەڵێن ئەم دنیــا بچووک و فانییە زیندانی ئیماندارانە. هەر ئەوەندەی سەرمان نایەوە ئازاد دەبین. جا لەوێ، لەوێ دنیایەکی پان و بەرین و هەمیشــەیی و پڕ لە ئەنواعی خۆشی و چێــژ و لەزەت بە رووماندا دەکرێتەوە. هەموو ئەو شتە خۆشــانەی لێرە حەرامن لەوێ حەڵاڵ دەبن. قبوڵم نیە و گەردنت ئازا ناکەم خۆشــیەکانی ئەو دنیــام لە کیــس بدەی. من هەقم بە ســەرتەوەیە کچەکەم. ئەی چۆن. هەقم بە ســەرتەوە هەیە. نە کــەس ببینە و نە با کــەس بتبینێ. ئاوها.. وەک تارماییەکی رەش و بێ گیان. وەکو با هاشەت بێ بەنێو داروبار و دڕک و داڵی ئەم جەنگەڵســتانەدا

رێی خۆت ببڕە و بڕۆ. چەندە زیاتر، لەم دنیایەدا، سەرت بەردەیتەوە، هێندە زیاتر لەو دنیادا سەرت بەرز دەبێتەوە. چەندە تۆ خۆت زیاتر لە خۆشــی و لەزەتــە دنیاییــەکان دوور بخەیتەوە، رێگای من بەرەو بەهەشتی خوا نزیکتر دەکەیتەوە. هەمیشە چاوەکانــم لەســەرتە کچەکەم. شــەوان لە ژووری خۆت، بــەرۆژ لە جادە وشــەقام، لەناو پۆلەکانی زانکۆ، لە نووســتنت، لە بێداریت، لە خەیاڵ و لە هۆشــیاریت، تەنانەت لە خەوبینینی شەوانەشتدا، ســاتێ لەناو دڵتم و ســاتێ لەناو مێشــکت. وەکو ســێبەر بەدواتەوەم. وامەکە بکەویتە بەر غەزەبی من کچەکەم، ئەگەر من لێت خۆش نەبم و گەردنت ئازا نەکەم دۆزەخ دەبێتە شــوێنی هەمیشــەییت. کەوابــێ، بەزەییــت بەمــن و بە خــۆت دا بێتەوە کچەکەم"..

باوکی، رۆژانە ئــەو قەوانەی بۆ لێ دەدایەوە. دەتگوت هەموو ئەرکی سەرشــانی و، خەمی وەکو باوکێک و، پەیامی وەکو مرۆڤێک و، فەلسەفەی وەکو مەخلووقێک هەر ئەوەندەیە دابنیشــێ و چاودێری

کچەکەی بکات. مەگەر دەکرێ ژیانی مرۆڤێک هەر بریتی بێ لە ئەوەندە؟ مەگەر دەکرێ هەر باوکێک ئەمــە ئەرکی بێ وتەواو. باوکی هەندێجار لە کاتی ئامۆژگارییەکانی دا لێی دەپاڕایەوە. دەکرووزایەوە. دەگریــا. هەندێجار ئاهەنگی خشــداری دەنگی پڕ دەبــوو لــە هەرەشــە. دەنگی دەگۆڕا بــە تەپڵ و لێک هەڵسوونی دوو شمشێربە سەریەکدا. ئەویش دڵی بۆ باوکی دەســووتا و، تەنانەت دەگەیشــتە ئــەوەی پەلمەگیرە بیگرێ و چاوەکانی پڕ دەبوون لــە فرمێســک و لە دڵی خۆی دا دەیگوت "باشــە بابە. بە چاوان. لێ ناگەڕێم دەرگای دۆزەخ بەهۆی منــەوە بەســەر تــۆدا بکرێتــەوە، چۆن شــتی وا دەکــەم. دەزانم تۆ منت پەروەردە کردووە. هەقت بە سەرمەوە هەیە. ئەی چۆن، هەقت بە سەرمەوە هەیە. خۆ شێت نەبوومە. بایی ئەوەندە ئەقڵم پێ دەشــکێ بزانم ئێمە بەو ناسکی وجوانییەمانەوە، بەم هەموو لەززەت و خۆشــییەمانەوە، بەم هەموو لەنجــە ولارەمانــەوە خۆڵقێندراویــن تــا توانــا و ئیرادەی خۆڕاگریی ئێوەی پیاوان تاقی بکەینەوە.

ئێمەین چارەنووســی پاشەڕۆژتان دیاری دەکەین. ئێمەیــن رێگای بەهەشــت و دۆزەختــان لەبەر پێ دا رادەخەیــن. بــەڵام خەمت نەبــێ بابە، رێگە بە چاوەکانم نادەم سەیری ناو چاوەکانی هیچ پیاوێک بکەن، تەنانەت چاوەکانی تۆش، کە هێشتا نازانم رەنگیــان چۆنــە. لــێ ناگەڕێم هیــچ پیاوێکیش، مەحرەم بێــت یا نامەحرەم، ناو چاوەکانم ببینــێ، تەنانــەت تۆش. تەنها ســەیری بەرپێیەکانی خۆم دەکەم. وەک ئەوەی تا ئێســتا هــەر وام کردووە. ئەوەندە ســەیری بەر پێیەکانی خــۆم دەکەم، لە هەموو خەڵکێکدا تەنهــا پێڵاوەکانیان دەبینم. لە پێڵاوەکانیانڕا دەزانم کچن یان کوڕ، ژنن یان پیاو، گچکەنە یان گەورە، هەژارن یان دەوڵەمەند، ساغن یــان نەخۆش، قەڵەون یــا لاواز. تەنانەت دەتوانم کەسێتییەکانیان لە پێڵاوەکانیانەوە شی بکەمەوە. رەنگــە پێم باوەڕ نەکەی بەڵام لە پێڵاوەکانیانەوە دەزانــم کێ گرفتــی هەیە و کێ ئاســوودەیە. کێ ئاقڵمەنــدە وکــێ گەمژەیە. کێ قورســە لە رووی کەســایەتییەوە و کێ ســووکە. کێ خەمهەڵگرە و

کێ خەمسـاردە. کێ بە دینە و کێ بێ دینە. کێ شەرمنۆک و کێ بێ شەرمە. من لە پێڵاوەکانی هەر کەسێک دەزانم کێ لەرووی دەروونییەوە ئاڵۆزە و کێ دەروونێکی بێ گرێ و ئارامی هەیە. چاوەکانم بوونەتـە دوو پارچـە ئاوێنـە، کـە تەنهـا وێنەی پێڵاوەکان وەردەگرن. شـەوان لاپەڕەی ئەلبوومی چاوەکانـم هەڵدەدەمـەوە تـا بزانم ئەمـڕۆ چەند جـۆرە پێڵاوم بینیوە. ئـەرێ بابە، دەزانم. من لە پێڵاوەکانیانەوە دەتوانم ناو مێشـکی هەر کەسێک بخوێنمەوە. من لە رەنگی پێڵاوەکانیان، لە جۆری پێڵاوەکانیـان، لە قەبـارەی پێڵاوەکانیان دەتوانم بیر وئایدۆلۆژیا و ئاراستەی فیکرییان بخوێنمەوە. خـۆ من لەماڵـەوەش بابـە، لە ماڵـەوەش کاتی میوانمان دێ، لە پێڵاوەکانیانەوە دەیاننناسـمەوە. پێڵاوەکانیشیان بگۆڕن هەر دەیاننناسمەوە. خزمی وامان هەیە لە پێڵاوەکانییەوە دەزانم چەند گەورە بووە و، تەمەنی گەیشـتۆتە چەند سـاڵ. لە دیار نەمانـی جووتە پێڵاوێکەوە دەزانم کێ مردووە. لە جـۆری پێڵاوەکانیانڕا دەزانم کێ ژنی هێناوە. کێ

شووی کردووه. کێ قاچێکی پەڕیوە. کێ پێی دەستکردی هەیە. خزمەکانمان پێڵاوەکانیشیان بگۆڕن هەر دەیانناسمەوە. چونکە دەزانم ژمارە و زەوقی هەر یەکێکیان لە پێڵاوکڕیندا چەند و چۆنە. ئەوەندە لە مەودای نێوانماڵەوەمان و زانکۆ ورد بوومەتەوە لە پێڵاوەکانی خەڵکیدا تەنانەت دەزانم نرخیان چۆنە. مۆدێلەکانیان چین. هی چ وڵاتێکن و لە چ کارگەیەک دروست کراون. دەزانم هەر پێڵاوێک چەند تەمەن دەکات. جاری وا بووە، بێ ئەوەی جەستە و سەر و دەم وچاوی پیاوەکە ببینم، تەنها لە پێڵاوەکانییەوە حەزم لێی کردووە. ئارەزووم کردووە شووی پێ بکەم. زۆر جاران بۆ سەرقاڵکردنی خۆم، لە مەودای نێوان ماڵ و زانکۆ دا، پێڵاوەکان دەژمێرم. هەندێکجار تاک دەردەچن، زۆر جارانیش جووت. ئەوەندە سەیری پێڵاوەکانم کردووە بابە، شەوانیش لە خەونمدا پێڵاو دەبینم. بە ڕۆژ چاوەکانم پڕ دەبن لە پێڵاو. شەوانیش پێڵاوەکان پڕ دەبن لە چاوەکانم. لە خەونەکانمدا دەبینم هەندێجار لە جیاتی دوو چاو،

جووتێ پێڵاو له ژێر برۆكانی مرۆڤێكدایه. هەندێك جاریش مرۆڤێك دەبینم، لەجیاتی پێڵاو چاوەكانی منــی لــه پێ دایه. ئاخر نــه ئەوەیه تا تۆ بەهۆی نەزەر كردنی من نەچیته دۆزەخ هەمیشــه ســەرم بەرداوەتــەوە بەرپێــم و قەت ســەر و روخســاری مرۆڤەكانم نەبینیوە. هەندێجار وادەزانم مرۆڤەكان هەر ســەریان پێوە نیه. بەراست بابە، جاری وایه دەمەوێ لێت بپرسم خوا سەرو چاو و گوێ و دەم و لووتــی بۆچــی له مرۆڤەكاندا دروســت كردووە. پێــت وانییــه له مل بە ســەرەوە زیادییه. چونكه هەموو پێكهاتەكانی سەر، چاوگەی گوناحن. ئەی وانیــه بابــه؟ مادامەكێش له زیندانــی دنیا دابین ئەقڵیشــمان بــۆ چییه. ئــێ زیندانییــەك ئەقڵی بۆچییــه. هیــچ. وانیــه. بــەڵام دەی. نەمدەوێرا، هیــچ كاتێ نەموێرایه پرســیارت لــێ بكەم. ئەی ئــەوە نەبــوو دایكم، چونكه بــەردەوام لێیت دەدا و ئازاریــت دەدا، یــەك جــار لێی پرســیت "ئەرێ پیاوەكه تۆ ویژدانت هەیه" هەر ئەوەندەی پرسیی و تۆش كوشتت. ئێ منیش لەوێ ڕۆژێوە هەر لێت

ترســـام. هەمیشە لێت ترسام. ئێستایش هەر لێت دەترســێم. وادەزانم مرڤەکان لە جێی چاوەکانیان جووتــێ پێڵاو هەیە. لە جێی لووتیان تاکێ پێڵاو هەیە. دەمی هەرکەسێکیش تاکە پێڵاوێکە. هەندێ شــەو لە خەونمدا دەبینم لەگــەڵ تاکە پێڵاوێکدا. نــە. نە. گێڕانەوەی ئەو جــۆرە خەونانە گوناحن. بەڵام خۆ خەونبینین بەدەست خودی مرۆڤەوە نیە بابە. ئەگینا بە دەست من بوایە نەمدەهێشت ئەم جۆرە خەونە حەیابەرانە ببینم و دەرگای دۆزەخت بە روودا بکرێتەوە. شەوان بەر لە نووستن وێرد و دوعاش دەخوێنم بابە. بەڵام هەندێ پێڵاو هەن زۆر بێ شــەرمن. بێ حەیان. رووت وقووت بێ ئەوەی ئیزنــم لێ وەربگــرن خۆیان دەکەن بــە خەونمدا. لێــم دەبن بە ئەهریمــەن و راوم دەنێن . دەمگرن. دەمگەوزێنن. دەکەونە ســەر ســینگم. دەستبازیم لەگەڵ دەکەن. بەســەر شەپۆلی هەناسەمدا مەلە دەکــەن و بەرەو کانیــاوی لێوەکانم دێــن. ئەوان قسەی خۆشــم بۆ دەکەن وختۆکەی رۆحم دەدن. پێڵاوەکان دەڵێن هەناســەم بــۆن عەتر و گوڵاوی

لێ دێت. دەڵێن چاوەکانم لە شینی دا لە ئاسمان دەچن ولە ڕۆشـنی دا لە ئەسـتێرە شـۆڕاوەکانی دوای بارانی شـەوان. گەمە لەسـەر قـژم دەکەن و دەڵێـن لە تاڤگەی ئارمووشـی خاو دەچێ. من هەوڵدەدەم خۆمیان لێ دوور بکەمەوە بابە. بەڵام ئەوان، پێڵاوەکان، ئەوەندە قسەکانیان خۆشن دڵم نایـێ لە خەونەکانم وەدەریان نێـم. هەموو گیانم خاو دەبێتـەوە. دادەهێزرێم. پەنجەکانی دەسـتم هێزیـان تێـدا نامێنێ و خۆم رادەسـتیان دەکەم. دەزانم بابە دەزانم، دەزانم ئەو خەونە ئەهریمەنیانە بـۆ دوارۆژی تـۆ دەبنە مایەی ئـازار وئاگر. بەڵام چی بکەم بابە. پێڵاوەکان ئەقڵیان بەوە داناشکێ. پێیاندەڵێم لەبەر خاتری باوکم. با بە هۆی منەوە لـە ئاگری دۆزەخ نەسـووتێ، بڕۆن وازم لێ بێنن. ئـای لە بێ حەیایی پێـڵاوەکان. ئای ئەو پێڵاوانە لـە خەونەکانمدا چەندە بێ شـەرمن. بەڵام نازانم بۆ ئەگەر شـەوێکیش لەبیریان بچێ و نێن بەسەر وەختـی خەونمدا، دڵم تەنـگ تەنگ دەبێ بۆیان، غەریبییان دەکەم".

بــه خێرایــی، وەک ئــەوەی ســەریان نابێتــە دوایــەوە، یــان لــە ترســێک و هەڕەشــەیەکی چاوەڕواننەکراو هەڵبــێ. بەنێو ئاپۆڕا و جەنجاڵی پێڵاوەکانــدا ڕێــگا دەبڕێ، دەڵێی بایەو هاشــەی دێ. ڕێگای هەموو ڕۆژانێتی. بە کاشییەکانی سەر شۆســتەکانەوە دەزانێ گەیشتۆتە کوێ و چەندی ماوە بگا. بەو خێراییەی دەڕۆیی جەســتەی لەلای راســتەوە بە توندی بەر جەستەی کەسێک کەوت. ئەمە یەکەمجار بوو ئەم ڕووداوە ڕوو بدات، ڕووداو نەبوو، لە راســتیدا زیاتر لە کارەســاتێکی مرۆیی دەچــوو، یــان بوومەلەرزەیــەک بە ریشــتەرێکی یەکجار زۆر. بۆ ماوەیەکی کورت هاوســەنگی تێک چوو. ترســا. پەشۆکا. دەتگوت دنیای لەلا سەراو بن بوو. ئاگای لەخۆی نەماو بۆ یەکەمجار ســەری هەڵبڕی. هەســتی کرد گلێنەکانــی رژانە بەرپێی. رژانــە ســەر لمووزەکانــی پێڵاوەکانــی پیاوێــک. ئاخــر لەگەڵ پیاوێکدا خۆیــان لێکدابوو. ئای لەو کارەســاتە. ئــەو دوو دەرگای بینــی لەنــاو چاوە دەرپۆقیوەکانی پیاوەکەدا ڕوو لە دۆزەخ کرانەوە.

چاوە دەرپۆقیوەکانی پیاوەکە لە دوو چاڵی ئاگری دۆزەخ دەچــوو. هەردووکیــان ماوەیەک لە یەکدی رامان. ماوەیەکی ئەوەنــدە کورت، نەدەکەوتە ناو زەمەنــەوە. دواتر پیاوەکە ســەرێکی باداو رۆیی. گومانێک کەوتە ناو مێشکی" چەند لە کچەکەی من دەچوو... بڵێی ئەو بێ"؟!

ئەویش وەک جاران ســەری خۆی بەردایەوە و درێــژەی بە رێگای خــۆی داو گومانێک کەوتە ناو مێشــکی "چەند لە باوکم دەچــوو.. بڵێی ئەو بوو بێ"؟!.

لەگـەڵ تریشـقە گورچکبڕەکـەدا، دایکـت قیژەیەکی لێ هەستاو خۆی کوتایە پاشخانییەکەوە. تـۆ ئەوت لەوێ نەبینی، بەڵام دەتزانی ئێسـتا لە تاریکترین قوژبنی پاشـخانییە پـڕ لە گوناحەکە، خـۆی ئەوەنـدەی پشـیلەیەکی لاواز و سـیلدار گرمۆڵە کردووە و زاتی ئەوەی نیە دەستی لەسەر چاوەکانـی لابـدا. هەموو جەسـتەی بـە دەرەوە بوایـە باکی نەبوو. کەچی بـەردەوام هەوڵی دەدا چاوەکانی لەبن لەپی دەسـتەکانیدا بشـارێتەوە، دەتگوت لەکەسـێک دەترسێ و چاو لە هەرلایەک بکات ئەو کەسە دەبینێ، چەندین جارت بینیوە بە

هەر دە سەرپەنجەکانی دەستی دەکەوتە وێزەی چاوەکانی و هاواری دەکرد "خۆزگە کوێر بام.. خۆزگە لە هەردوو چاو کوێر بام.. بۆچیمن"!!.

نەتدەزانی بۆ ئەوەندە لە چاوەکانی بێزارە. لەگەڵ ئەوەیدا، کە ئەو پیاوەی زیاتر لە باوکت مێردی دایکت بوو، هەمیشە پێی دەگوت: "چاوەکانت دەڵێی مێوژی رەشن، وەک شووشە وان، پیاو، هەزار کەڕەت جوانتر خۆی لە نێو گلێنە زولاڵەکانتدا دەبینێ".

بەلام ئەو هەر دەیگوت "باشتر وایە سەگ بیانخوا. من لە کرمێک و چوار دیواری چڵکن و پیاوێکی رەزا قورس زیاتر چیان پێ دەبینم.. با هەر نەمبن". کە باسی کرمی دەکرد، خوێنێکی گەرم دەزایە ناو هەموو دەزوولە دەمارەکانی ناو چاوانت، بۆ ساتێ دایکت و ناو ژوورەکە، هەموو، رەنگی سووریان بەسەر دا دەپژا.. دایکت لەوە دەترسا چاوەکانی وەک جووتە ئاوێنەیەک گوناحەکانی پاشخانییەکەی تۆمار بکەن و رۆژێک دابێ هەمووی لێ ئاشکرا بکەن. بۆیە بەردەوام

سەری بەرز دەکردەوە، وەک ئەوەی لە مێشە وشکبووەکانی هەڵواسراو بە بنمیچی ژوورەکەدا بپارێتەوە، دەیگوت "دەبا ئەو دوو چاوەشت پێ نەدابام. وەک ئەوەی هیچت پێ ڕەوا نەبینیم ئەم دوو چاوەشت پێنەدابام"..

لە دوای هەر تریشقەیەکدا، کە هەور دەیگرماند، گوێت لە دەنگی قیژەیەکی کپ دەبوو لە پاشخانییەکە. جاری وا هەبوو، هەستت بە بەزەییەک دەکرد بەرامبەری، بەڵام ئەو هەستەت هەر ئەوەندە لە دڵدا دەمایەوە کە شەوقی برووسکێک سینگی ئاسمانی شەقار دەکرد. لە پشت ئەو پەنجەرەیەی ژوورەکەتانی بە کۆڵانەکەوە دەبەستەوە و ژەنگی ساڵانێکی دووروودرێژ بۆ هەمیشەی داخستبوو، دەنگی ژەنینی دەف دەهات. چاوت تێبڕیبووە نایلۆنە چڵکداپۆشیوەکەی پەنجەرەکەوە. دەتگوت چاوەڕێ دەکەی دەفژەنەکە لەوێوە بێتە ژوورەکە و ئەوەندە بە دیارتەوە بوەستێ و دەفت بۆ بژەنێ تا ڕۆحی خەوتووت هەستێنەوە و جەستەی مردووت وە جووڵە بخا. بەر لە ماوەیەک دەفژەنێکی

نورانییـــان هێنـــا و ســـێ ڕۆژ بە دیارتـــەوە دەفی ژەنی و ســـەمای زیکری دابەستا کەچی لە کۆتایی سێهەم ڕۆژدا دەستی هەڵگرت و دەفەکەی کردەوە ملـــی و گوتی "ئـــەو جنۆکانەی ڕۆحی ئەو کچەیان خەوانـــدووە بەهێزترن لـــەوەی دەفی من وەدەریان بنێ"!

باوکت گوتی "ئەی دەبێ چار چی بێ؟"

ئەو هەر ســـەرێکی باداو، بێ ئەوەی هیچ بڵـێ، ژوورەکەی جێ هێشـــت. ئەوەنـــدەی کردت زمانت نەسووڕا پێی بڵێی "کەمێکی تر بەردەوام بە، ڕۆحم خەریکە هەستێتەوە.. بەس کەمێکی تر بەردەوام بـــە".. بەڵام زمانت نەجووڵاو، کەســـیش لە نیگات حاڵی نەبوو. لەو ساوە دەڵێی ئەو دەنگەت لێ بزر بوو.. یان دزرا.. ئێســـتا ئەمڕۆ، جارێکی دیکە و، ڕەنگە هەمان دەفژەنەکە بێ گەڕابێتەوە. گەیشتە ناو چوارچێـــوەی پەنجەرەکە و، وەک تارماییەکی کەمڕەنگ، ئەوەندەی کە هەست بە بینینی بکەی، ڕاوەســـتاو دەنگی دەفەکەیش لەگەڵ ڕاوەســـتانی ئەودا کپ بوو.

"هــۆ خەڵكینە هۆ. ئەوەتا ئاســمان گەیشــتە ســەر سەرمان و دنیای فانی چەند ساتێكی زیاتر بەبەرەوە نەماوە. ئەمە دوا دەرفەتە. فریای خۆتان كەون و"......

شــریخەی هــەور، دەنگی بــە دەفژەنەكە بڕی و ئاســەوارە كەمڕەنگەكەیشــی بەســەر نایلۆنــە چڵكنەكەی پەنجەرەكەوە نەما. دایكت بە ئەسپایی لــە پاشــخانییەكە وە دەركــەوت. ڕەنگــی تەواو هەڵبزركابوو. چوو لە ئاست پەنجەرەكەدا وەستا. وەك ئــەوەی زاتێــك بداتە بەرخــۆی و چەپۆكی ترسەكە لە دەوری گەردنیدا خاو بكاتەوە.

"چ غەزەبێكە بەرۆكی ئەو خەڵكەی گرتووە"...

دەنگی دەفەكە لە دوور ڕا هەر دەهات و نزیكتر دەبۆوە.

"ئەمــە ســێیەم ڕۆژە هەورە برووســك دنیای وێــك هێناوە، كەچی بۆ دەرمانیش دڵۆپێك باران نەكەوتە ســەر ئەم خاكە هەڵكــڕووزاوە".. دەنگی دەفەكە هەر دەهات و نزیكتر دەبۆوە

"هەور كۆڵانەكانی وڵاتی بەجاریێ داگرتووە"...

هەمــوو جەســتەت ببــووە گوێ بۆ بیســتنی دەنگــی دەفەکە. هاوارێک لــە دەروونت دا پەنگی دابۆوە، دەتویســت بەســەر دایکت دا بقیژێنی تا لەبەر پەنجەرەکە لاچێ.

"رۆژگار بۆتە شەوێکی درێژ.. درێژ.."

دەنگــی دەفەکــە ئەوەنــدە درێژ بــۆوە، وەک خوێنێکی گەرم دەرژایە ناو دەمارەکانتەوە.

"چ شەوە زەنگێکە و کۆتایی نایێ".

دایکت وەک یەکێک لەو ســەدان مێشــەی لێ هاتبــوو، کــە وشــک هەڵگەڕابوون و بــە نایلۆنی پەنجەرەکەوە نووسابوون.

"ئاســمان لەبــن بــاری ئــەو هەموو هــەورەدا داتەپیوە و کەیشتۆتە سەربانیماڵەکان".

پڕ بــە دەنگت زریکانــدت، راتچڵەکاند، چاوە گوناە تێزاوەکانی چ ترسێکیان تێ کەوت، زریکەی تــۆ لــە تریشــقەی هەورەکــە زیاتــر رایچڵەکاند. بــەر پەنجەرەکــەی بــەردا. دەنگــی دەفەکە وەک گەیشتبێتە دەروازەی رۆحتەوە، دەتگوت بە سیحری ئەو ژەنینە گــەرم و خێرایە، ئەندامە مردووەکانی

جەستەت وزەیان تێ دەزێ و، بە جووڵە دەکەون.
دایکت وەک هێمایەکی سەرسوڕمان بە دیارتەوە چەقیبوو. ئاوها لە چاوەکانت رامابوو وەک ئەوەی شتێکی تیایاندا بەدی کردبێ. دەفڕەنەکە بۆوە تارماییەکی کەمڕەنگ و کەوتەوە ناو چوارچێوە چڵکنەکەی پەنجەرەکەوە. دەنگی دەفەکەی بڕی "هۆ خەڵکینە هۆ.. ئەوەتا ئاسمان گەیشتە سەرسەرمان و دنیای فانی چەند ساتێکی زیاتر بەبەرەوە نەماوە.. ئەمە دوا دەرفەتە.. فریای خۆتان بکەون و روو لە قاپی"..

هاشەی با پاشماوەی پەیامەکەی دەفڕەنی رامالی و بردی. دایکت خێرا بەرەو دەرگا رۆیی و کردیەوە. بەر لەوەی بەتانیە رەشە هەڵواسراوەکە لابدات، دەرگای لە پشت خۆیدا داخست، چەند ساتێکی زیاتر پێ نەچوو، کە گەڕایەوە بۆنێکی خەستی میزی لێ دەهات. "با" یەکەش تەواو ئالۆسکاندبووی.

"ئاسمان داتەپیوەتە سەربانی ماڵەکان.. هاکا لەگەڵ زەویدا تەختی کردین. چ غەزەبێکە

بەرۆکمانی گرتووە.. چ غەزەبێکە"...

دایکـت لـە بەرامبـەر ئاوێنـە تەڵخەکـەدا وەستا، بەسـەر پەنجەکانی کەوتە پشکنینی قژە خورماییەکەی..." داو داوی سپی تێکەوت"..

زۆر جـار واتدەزانـی قسـەکانی باوکـت لـە کونەکانـی لووتیـەوە دەردەچـن، یـان لـە کونە گوێچکەکانیەوە.. سمێڵی ئەوەندە پان و گەورە بوو تا ئێسـتا ڕێکنەکەوتووە دەم و لێوەکانی ببینی، وەک ئەوەی دەم و لچێکی زۆر ناشـیرینی هەبێ و بۆ هەمیشـە لە ژێر سمێڵەکانی دا شاردبێتییەوە، لە کاتی قسە کردنی ئاساییدا تەنانەت سمێڵیشی نەدەجوولا، بەڵام کە تووڕە دەبوو ئەگەر بە وردی تێی ڕامابایت، جووڵەیەکی کەمت لە سمێڵەکانیدا بەدی دەکرد.

"جـا تـۆ جحێڵ بی یـان پیـر چ خێرێکت لە قونێدا هەیە"؟!

دایکت بێ ئەوەی لە بژارکردنی داوە سپیەکانی نـاو قژە خورماییەکەی دەسـت هەڵگـرێ وەڵامی باوکتی دایەوە "ئەگەر باوکە خێر لەخۆ نەدیوەکەم

منی بە خوشــکە ترشاوەکەت نەگۆڕیبایەوە خێری من بەشی وڵاتێک بوو"...

باوکــت مژێکی گــەورەی لە جگەرەکــەی دا، ماوەیەک جەستەی لەگەڵ کۆخە کۆخدا هەڵبەزی ودابــەزی، تۆپەڵە بەڵغەمێکی لە بنی ســنگییەوە راکێشــاو، زانی فریا ناکــەوێ دەرگاکە بکاتەوە و بەتانیە رەشــە هەڵواسراوەکە لابدات، بۆیە هەر لە جێگەی خۆیدا، تێی گرتە لادیوارەکەی بەرامبەری.

"تۆ دارێکی بێ بــەری... ئافرەتێک منداڵێکی لێ نەیەتە حاســڵات بــۆ مردن باشــە.. کرمێکت خســتۆتەوە، ئەوە پانزە ســاڵە لەســەر تیراقەی پشت کەوتووە نە دەجوڵێ و نە دەمرێ"..

خوێنێکــی گــەرم تێزایە ناو هەمــوو دەزوولە دەمارەکانی نــاو چاوەکانتــەوە، دەتگوت لەناکاو رەنگێکی سووریان پژاندە هەموو ژوورەکە.

"ئەم کرمە هــی تۆی گەوادە کە توانات نەبوو وەک پیــاوان منداڵێکــی ســاغ و ســەلیم بخەیتە زگمەوە"..

پێڵــووی چاوەکانــت نایــە ســەریەک، هات و

هاواریـــان دەتگـــوت زەنگەزۆرەن و شـــالاو دەبەنە ناو کاسەی ســـەرت. نزاکەی دایکت لەناو مێشکی تۆیشدا دووبارە بۆوە:

"وەک ئـــەوەی هیچت پێ رەوا نەبینیم خۆزگە ئـــەو دوو چـــاو و دوو گوێیەشـــت پـــێ نەدابـــام.. خۆزگە"...

کە دەنگـــەکان لەناو گوێچکەکانتدا کپ بوون، پێڵووی چاوەکانت لێک کردەوە. باوکت بە توورەیی دەرگاکەی کردەوە، بەتانیە رەشە هەڵواسراوەکەی لاداو لەبەر چاوانت بزر بوو. دایکیشـــت خزایە ناو پاشـــخانییەکە و، هاوارێکـــی بـــۆ کۆتاییش لەناو سینگی تۆدا پەنگی دایەوە. سەرت بە لایەکدا لار کردەوە. چاوەکانت تێبڕییە پەنجەرەکە و هەستت بۆ دەنگی دەفەکە راگرت. تەنها هاشـــەی با یەکی بێ ئامان دەبیسترا وهیچی دی.

دەتگـــوت بـــا بوو پاڵـــی بە دەرگاکـــەوە ناو، کردییـــەوە و پیاوێکی فڕێ دایە ژوورێ. ئەو پیاوە پتر لە باوکت سەری بەمماڵەدا دەکرد و، لەویش زیاتر لەگەڵ دایکتدا دەچوونە پاشخانییەکە. تۆیش

وەک کەروێشـــکێکت لێهـــات دەســـت و قاچیان بە پەتێکەوە بەســـتبێ و شـــەوقی چەقـــۆ لە چاوانی دا بریقـــەی دابـــێ، ئەوەندە بەهێز لـــە زریکەیەکی نەبڕاوەتـــدا دەتگوت دنیا ســـەراوبن بوو. پیاوەکە بەنەخوێن بەدەســـت بەرەو دەرگا هەڵات و دایکت خێرا و پەشـــۆکاو ناو لەپێکی دەســـتی نایە سەر دەمت و بێ دەنگی کردیت

"ئارام بە کچەتیو.. ئارام بە. ئارام"...

لە چاوەکانی دایکت رامای.

"چیە...گوناه لە چاوەکانم دەچۆڕێ"؟

ویستت سەرێک بلەقێنی، بۆت نەکرا.

"دەزانـــم.. ئەوەندەیش بەردەوام دەبم تا لەناو گوناحدا بخنکێم"..

دایکـــت هەمـــوو گیانـــی دەلـــەرزی، لێـــت دوورکەوتەوە.

"ئەگەر گوناه نەکەم چی بکەم".. چی بکەم؟.. قیژاندی بەسەرتدا:

"تۆ پێم بڵێ بۆگەن.. تۆ پێم بڵێ. گوناه نەکەم چـــی بکەم.. لە بۆنی بەڵغـــەم وجگەرە زیاتر چیم

له باوکت بینیوه؟ له لێدان و جوێن و سووکایەتی زیاتر چی پێ بەخشیوم؟ من قوڕی تۆم شێلاو ئاوها فڕێتم دایە دنیا؟ من "؟ ..

گریان کەوتە قوڕگیەوە. مەزلوومانەتر دوا:

"نا.. من نەبووم.. ئەگەر قوڕی تۆ لە دەستی مـن بوایـه ئەوەندەم چاک دەشێلای و ئەوەندەم جوان دروست دەکردی نەک هەر باوکت، وڵاتێک ئافەرینم لێ بکات"...

دەتگوت لەبەردەم دادگا راوەستاوە و بەرگری لەخۆی دەکا لە بەرامبەر گوناحەکانیدا "دەزانم بۆ زریکاندت.. هەر ئەوەندەم لەدەست ماوە دەتەوێ لەوەندەشم بکەی.. نا.. پێت ناکرێ.. ئەگەر درێژایی زریکەکانت لەمبەر بۆ ئەوبەری ئاسمان بێ، ئەو پیاوە هەر دێتە ئێرە.. ئەمیش نەبێ پیاوی دیکە دێتە ئێرە.. ئەوەندە پیاوان دەبەمە پاشخانییەکە تا باوکت بکەوێتە پاڕانەوە و قامکە سمێڵەکەی بخشێنێ بە..."

گرمەی لەناکاوی هەور رایچڵەکاند. بە ئارامی لێت دوورکەوتەوە و چوو لەبەرامبەر پەنجەرەکە

راوەستا:

"منیـــش حەزم دەكرد بـــە دڵی خۆم مێردم بە كوڕێكـــی جـــوان و جاحێڵ كردبا.. حـــەزم دەكرد لەناو ژوورێكـــدا بژیم بۆنی گەنیوی تف وبەڵغەمی باوكت و میزو پیسی تۆ داینەگرتبا. منیش حەزم نەدەكرد تـــۆ ئاوها بوایتایە.. حەزم دەكرد هەموو بەیانیان ئەو قژە ئاوریشـــمیەتم جوان جوان شانە كردبا.. قردێلەی حەوت ڕەنگم لە قژت دابایە. جل وبەرگێكـــی جوانم كردبایە بـــەرت و جانتایەكم لە كۆڵـــت قایم كردبا و ڕەوانـــەی مەكتەبم كردبای.. منیـــش حەزم دەكرد.. هەوڵیشـــمدا.. چوومە لای پیر و پیاو چاكان. دەســـتی شـــێخ و مەلایانم ماچ كـــرد، تۆپەڵ تۆپەڵ نووشـــتە و دوعام بە تۆو بە خۆمەوە هەڵواسی، هانام بردە بەر سیحر و جادوو.. تەنانەت بۆ ئەوەی منداڵێكی دیكەم ببێ و باوكت ئەوەندە دەندووك لەســـەرم نەداو سووكایەتیم پێ نەكا، لەگەڵ پیـــاوی فەحل و كەڵەگەتیش جووت بووم.. هیچیان ســـوودی نەبوو. هیچ. ئەو وشـــك كردنەبوو وشكم كرد و تەواو"..

دایکت لەبن پەنجەرەکە دانیشتبوو، پشتی دابووە دیوار و دەگریا.. "هەر تۆم بوو و ئیدی وشکم کرد.. تۆش ئەو دەڵەمەیە دەرچووی.. نە پێت گرت و شەقاوێکت نا.. نە زمانت جووڵا گوێم لە دەنگت بێ. نە ئەوەبوو بمری و"... دایکت ئەو دوو دڵۆپە فرمێسکەی نەبینی لە گۆشەی هەردوو چاوتەوە خزان و لە بنا گوێتەوە تێکەڵ بە قژەکانت بوون. دەنگی دەفەکە لە دوور ڕا هات. دایکت گەڕایەوە لای ئاوێنە تەڵخەکە و کەوتەوە بژارکردنی داوە سپییەکانی ناو قژە خورماییەکەی."

لە هەڵاتنەکەیا جێتمان هێشت.. مانگێکمان پێچوو تا گەڕاینەوە، لە دڵمان یەقین بوو ئێستا مردوویتە و خەمی ئەو بۆنەمان بوو کە دەبێ وڵاتی داگرتبێ.. ئێستاش هەر نەمانزانی ئەو مانگە کێ خواردنی کردە دەمتەوە.. کێ تەڕ و هیشکی کردیت.. کێ چۆڕە ئاوێکی خستە قوڕگتەوە.. ئێ خۆ کەسیش مانگێک، بێ خواردن و خواردنەوە ناژی.. ئەویش تۆ.. هەر لەناو پیسایی خۆتدا دەخنکای.. ئێستاش هەر نەمانزانی کێ مانگێک ئاوها خاوێن و بژوێنی

راگرتیت"...

دایکـت هەناسـەیەکی پـڕ لـە حەسـرەتی هەڵکێشـا..." ئێمە واماندەزانی مردوویت." دەنگی دەفەکـە لـە دوورڕا هەردەهات و نزیکتـر دەبۆوە. چاوت لەسـەر پەنجەرەکە بوو. ئـەوێ تەنها کزە ڕۆشـناییەک بـوو بـەرەو دەرەوەی ئـەم ژوورە تاریک و شـێدارە. ئێسـتا دەنگی دەفەکە خۆشتر دەهـات. ژەنینێکی گـەرم و خێرا. خۆت بینی کە هەڵسـتایتەوە. سـەیری قەد و باڵای خۆتت کرد، جل و بەرگێکی ئاوریشـمی تەنک و هەزار و یەک ڕەنگت لەبەردابوو، ویسـتت بـە دایکت بڵێی، کە هێشـتا لەبەر ئاوێنەکە داوە سپییەکانی نێو قژی سەری بژار دەکرد.

"ئەها دایە چەند جوانم.. سەیری قەد و باڵا و جل و بەرگی بەرم کە"..!!

دەنگـی دەفەکـە گەیشـتبووە دەروازە واڵا کراوەکـەی ڕۆحتـەوە. خۆت بینی لەسـەر ریتمی ژەنینی دەفەکە، هەموو ئەندامانی جەستەی نیوە مـردووت کەوتنـە جووڵە.. نا.. کەوتنە سـەما..

سەمايەكى ئارام.. دەتگوت سەرپەنجەكانى هەردوو پێت لەسەر پشتى ماسيەكە و لەناو دەريايەكى شين و ئارام بەدەم رۆيشتنەوە سەما دەكەيت. هەرچەندە دەفەكە نزيكتر دەبۆوە، سەما رۆحانييەكەى تۆش ريتمێكى خێراترى وەردەگرت. كراسە ئاوريشمييەكەت شەپۆلى دەدا. دەفژەنەكە گەيشتە ناو چوارچێوى پەنجەرەكەوە. بەلام ئەمجارەيان نە دەستى لە ژەنين هەلگرت و نە پەيامێكى دا.. دەتگوت لەناو هەزاران ئاوێنەى تەواو بالادا، هەزاران خۆتت دەبينى بە دەورى دەفژەنەكەدا بازنەتان بەستبوو سەماتان دەكرد.

"ئەو هەموو منە"!...

شاگەشكە ببووى، دەتگوت كۆترێكى و لە قەفەس دەرچوويتە، جريوەى پێكەنينت ولاتى داگرتبوو. نەتزانى بەهار چۆن لەناو ئەو وەرزە تووش و سەختەدا، دزەى كردۆتە ئەو پانتاييەى بازنەى سەماتان لێى دابەستبوو.

بە هێمايەكى دەفژەنەكە و، بۆ ئەوەى ئاورِ بدەيتەوە لاى دايكت، كە هێشتا خەريكى

بژارکردنی داوە سپییەکانی ناو قژە خورماییەکەی بوو، جەستەیەکی گەنیوت لە ژوورە بۆگەنەکەدا جێ هێشت و بەسەر باڵی ئامەنگی دەفەکەدا هەڵکشایت...

پەری، وەک ئەوەی کەسێک راوەدووی نابێ بە پرتاو خۆی کوتایە ژوورێ، کە تۆی بینی خۆت خەملاندووە و هەستاویتیەتەوە و ئامادەی دەرچوونی، واقی وڕما و بە نەرمی قیژاندی بەسەرتدا:

- شێت بوویتە؟! ئەقڵت مابوو ئەویشت لە دەست دا!. ئاخر بەم دنیا تووشەوە کەس دەچێتە دەرێ داپیرەکەم. دەبچۆ بزانە گوێت لە چریکەی باڵندەش دەبێ تا بە مرۆڤ رابگا.

تۆ ژوانت هەبوو. هەر دەبوایە بچیتە دەرێ. نەخاسمە ئەمڕۆ، کە دڵە کوتێیەکی سەیرت

بوو. هەندێجار پێکەنینت بەخۆت دەهات. "ئاخر مەگەر ئەم دڵە پیر و تەمەڵەی من ئەو هێز و تاقەتەی تێدا ماوە ئەم کوتە کوتە بکات"! بە دەستە لەرزۆکەکانت بەدوای حەمایلەکەی سەر دڵت دا گەڕایت و کاتێ کەوتە ناو دەستەکانت بردت بۆ دەمت و راتمووسی. ساڵەهای ساڵە ئەم حەمایلەی ملت هێزی مانەوەت پێ دەبەخشێ و ترپەی دڵت رێک دەخات. پڕت دەکات لە وزەی چاوەڕوانی و بۆتە کانیاوێک بەردەوام هەداری و سەبرت تێدا دەڕژێنێ. خۆت نەبێ کەس نازانێ ئەم حەمایلە چی تێدایە. ئەو هەموو ساڵە نە بۆ کەسێکت درکاند و نەبۆ چرکەیەکیش لە خۆتت جیاکردەوە. هەمیشە دەستێکت لەسەر دڵت و لەسەر ئەم حەمایلە بووە. دەتگوت هێزی ژیان و وزەی چاوەڕوانی لێ وەردەگری. تۆ نەتبینی، بەڵام پەری بە حەپەساوی بەدیارتەوە راوەستابوو، چاوەکانی ئەبڵەق و دەمی کراوە و هەردوو دەستی بەسەر روومەتەکانیەوە بوو. دەتگوت ئەمڕۆ داپیرەیەکی جیاوازتر لە داپیرەی رۆژان و

سالانی پێشوو له بەرامبەری خۆی دا دەبینێ. ئەو روخسارە پیرەی کە دەتگوت زەوییەکی بێ پیتە و جوتیارێکی نەشارەزا و بێ ئومێد بە دوو ولاغی چەمووش و هەوجارێکی کوولّ کێلابووی و هەموو هێڵە چرچەکانی بەناویەکدا چوبوون و تێک ئالابوون، ئەمڕۆ درەوشانەوەیەکی سەیری تێ کەوتبوو. پەری نەیدەزانی لێت دەترسێ یان دەبێ باوەڕ بەوە بکات نوورێک زاوەتە نێو شانە مردووەکانی پێستی روخسارتەوە. پەری بە ترسەوە سەیری چاوەکانتی کرد و وای هەست کرد بینایی لە دەستچووت گەڕابێتەوە و تەنانەت بێ گومان بوو لەوەی تۆ ئێستا ئەو دەبینی. بەتایبەت کاتێ کە بزەی سەر لێوانتی بینی. هیچت لە دوێنێ نەدەچوو" چیت بەسەرهاتووە! چ موعجیزەیەک روویداوە"! دەستێکی لەبەرامبەر چاوەکانتدا هێنا و برد بەڵام هیچ جووڵەیەکی لە ئاراستەی نیگات بەدی نەکرد.

- داپیرە. چی روودەدا. ئەمڕۆ هیچ لە رۆژانی تر ناچیت.

تۆ پێکەنیت. پەری وای هەست دەکرد، مێشکی وەکو بەستەڵەکی بەر هەتاو خەریکە شەقاری تێ دەکەوێ. ترسا لە شێت بوون.

- ئەمڕۆ رۆژی پێککەیشتنە کچەکەم. تەواو، کۆتایی هات. ئەی گوێت لە ترپە شێتانەکانی دڵم نیە. ئەمڕۆ کۆتایی بە سالانی چاوەڕوانیمان دێ. تەواو. دەرگاکان بکەوە پەری. پەنجەرەکان بکەوە کچەکەم. ماڵ برازێنەوە. چێشتێکی خۆش لێ بنێ. ئەمڕۆ هەموویان دێنەوە. هەموویان..

پەری لە ترسی شێت بوونی خۆی، وەرسوڕا. نەیوێرا زیاتر رووبەڕووت راوەستێ و سەیری ئەو حاڵەتە بکات کە تێی کەوتبووی. لایەکی دەرگای کردەوە. هوڕوژمی بایەکی سارد و پڕووشکە باران و دەنگی گرمەی هەور، وەکو رەوە گورگێکی هار ویستیان پەلاماری ژووری بدەن. خێرا و بە زەحمەت دەرگای داخستەوە.

- گوێت لێ بوو داپیرەکەم. هەورێکی ئەوەندە رەش و ترسناکە دەڵێی ئاسمان هەر هێندەی بەژنی مرۆڤێکی ماوە داتەپێتە سەرزەوی و هەمووومان

پان بكاتەوە.

تۆ، وەک ئەوە وابوو جووتێ باڵت پێوە هاتبێ و مەیلــی زۆرت بــۆ هەڵفڕین هەبێ و، هەموو کون و ڕێگایەکــی دەرچوونی لێت گرتبــێ. وردە وردە تووشــی هەناســە تەنگی دەبووی. گەیشــتبوویە حاڵەتێک بقیژێنی بەسەر پەریدا. توورە بوونێک و پێویستیت بە هاوارکردنێک لەناخەوە هەڵدەکشاو گەیشــتبووە ناو قوڕگت. بەڵام پەری، ئەو یادگارە جوان و شــیرینەی لــەدوای ڕۆژە ڕەشــەکە دا لە باوەشــت لەنگــەری گــرت و دواتــر بــۆت بوو بە هەناســەی ژیــان، لــە پەرۆشــیی بوو بــۆ تۆ کە نەیدەهێشــت بەم بــاو بۆران و هەورە تریشــقەیە دا بچیتــە دەرێ. ئاخــر تۆش بۆ ئەو، یادگارییەک بووی لە هەموو کەســەکانی، کــە دەبوایە بمێنی. دەبوایــە بــە زیندوویــی بمێنی تاکو بــە یەکجاری بێکەس نەمێنێتەوە. تۆ بۆ ئەو بۆنی باوک بوویت و ئامێزی دایک. نەشــیدەزانی تۆ شەوی رابردوو، خەونــی گەڕانــەوەی هەموو ئەوانــەت بینیوە، کە لە ڕۆژە ڕەشــەکەدا، کەوتنە نێو کەڵبە تیژەکانی

رەوە سەگێک و گەردەلوولێک بردیانی. ئەنفالێک هەموویانی راپێچ کرد و کەس نەیزانی بۆ کوێی بردن..

– پەری. کچەکەم لەسەر رێگام لاچۆ و ئەو دەرگایەم بۆ بکەرەوە. هەناسەم تەنگ بووە. خەریکە دەخنکێم گوڵەکەم.

تۆ دەنگت لەرزی و پەرییش دڵی. ئاخر لەرەی گریان لەناو دەنگت دا بوو. پەری هەستی پێ کرد. بۆیە دڵی لەرزی. بەهێواشی لەسەر رێگات لاکەوت و دەرگاکەی بۆت خستە سەر پشت. بە دەست، ئەوت کە دەیویست لەگەڵتا بێت، گەڕاندەوە و بە بێدەنگی تێتگەیاند حەزت لێیە بە تەنها بڕۆیت. تەوژمی با بە هێزەکە، پاڵی پێوە نایت بۆ ژوورەوە. بەڵام تۆ هەموو هێزت دایە بەرخۆت و بێ منەتانە لە با و سەرماو پڕووشکە ساردەکانی باران دەرگاکەت لە پشت خۆتەوە پێوەدا. کەمێک راوەستایت. سەرێکت بەرزکردەوە. دەستیشت بەرز کردەوە بەڵام بەر ئاسمان نەکەوت "ئەی پەری بۆ گوتی هێندەی بەژنی مرۆڤێکی

ماوە ئاسمان بگاتە سەر زەوی"؟ دەتگوت لەناو هەورە رەش و تێکچرژاوەکاندا بەدوای کەسێک یان شتێک یان پەیامێکدا دەگەڕایت. دەتگوت ژوانت لەگەڵ کەسێکا هەیە و دەتەوێ پێی بلێی "ئەوەتا من هاتم. ئەی کوا تۆ. لە کوێیت" پێویستیت بە کەس نەبوو بتخاتە سەر رێگاکەو رێنوێنیت بکات. رێگاکە خۆت دروستت کردبوو. چەندەها ساڵ، بەهەموو رۆژەکانییەوە بەسەر ئەم رێگایەدا رۆیشتبوویت. نیازت بە چاو و بە بینین نەبوو تا بە سەریدا برۆیت و نەکەویتە لارێوە. ئەمرۆ شپرزەییەک بە هەنگاونانتەوە دیاربوو. ئەوەندە بە خێرایی هەنگاوت دەنا قاچەکانت تێکدەئالان. رێگاکەت بەلاوە هەر درێژ و درێژتر دەبۆوە. نەتدەزانی تۆ چاوەڕوانی کەسانێکیت یان کەسانێک لەو سەرگردەوە دانیشتوون و چاوەڕێی چوونی تۆ دەکەن بۆ لایان. دەستێکت بەسەر حەمایلەکەی سەر دڵتەوە بوو دەستێکیشت دابووە بەرخۆت تا چرنووک لە عەرزە تەڕەکە گیرکەیت و هەورازاییەکە ببڕیت. پێیەکت خلیسکاو کەمێک

خشـــايته دواوه . دڵيشـــت لەناو ســـنگتا خليسكاو دارِژا . شـــەوقى ترســـناكى برووســـكەكەت نەبينى چـــۆن پانايـــى ئاســـمانە رەشـــداگيراوەكەى وەكو بريقەى شمشـــێرێک لەت و پەت كرد، بەڵام گوێت لە شـــريخە و گرمـــەى هەورەكە بـــوو كە دەتگوت هەموو قوڵايى ئاسمانەكەى تەنى . رۆژان و ساڵانى رابردوو توورِەبوونێک هەموو گيانتى داگير كردبوو. نەتدەزانـــى لە كێ و لە چى . بـــەڵام توورِەبوونێک وەكو بۆمبێكى تەوقيتكراو، كە هەرگيز نەتەقێتەوە، لەنـــاو دڵت دانرابوو. هەموو فەزاى ناو ســـنگت و كاســـەى ســـەرتى پرِ كردبوو لە هەوايەكى قورس. ئەمرِۆ، لەوە دەچوو ئەو توورِەبوونە لەناو دڵى تۆ لاكەوتبێ و چووبێتە ناو دڵى ئاســـمانەوە . ئەمرِۆ ئاسمان لەباتى تۆ توورِە ببوو. هەورەكە بێ برِانەوە دەيگرماند و دەيشـــريخاند . نە لەوە دەچوو قوڵپى گريانێكى زۆر قورس، گەرووى ئاســـمانى گرتبێ و توانـــاى گريانى نەبێ، نە ئاســـمان ئێلنجى دەهات و دەيويست بەســـەر ئەم زەوييە پيس هەڵگەرِاوە دا برِشـــێتەوە و هێزى رشـــانەوەى تێدا نەبێ، نە

ئاسـمان دەیویست بە پانایی خۆی بەسەر زەویدا بتەپێ و هەموو شتێک لەژێر قورسایی خۆیدا بخنکێنێ و چی هەناسەیە بیبڕێت.

ئاخـر نەدەبوایـە مرۆڤـەکان ڕۆڵـی ئاژەڵـە درنـدەکان ببینن. پەیامی ئاسـمان وانەبوو زەوی ئاوها پیس هەڵگەڕێ و بۆگەنی دایگرێ. ویسـتی ئاسـمان وانەبوو مرۆڤەکان یەکدی بخۆن و بەسەر خۆیاندا بڕشێنەوە.

تینـت دایـە بەرخـۆت و لـە هەورازاییەکـە سـەرکەوتی. چویتە ناو کۆخەکەو لەسـەر تاشـە بەردەکـە دانیشـتی و چـاوت بڕییـە ڕێگاکـەوە. پێویستت بە بینایی نەبوو. ئێستایش کە تەمێکی خەست هەموو ئەو خوارەو ناو چەمەکە و قەدپاڵی کێوەکانـی بەرامبەرتـی داگرتبوو، تـۆ بە زوڵاڵی ڕێگاکـەت دەبینی. تەنانەت هێلانەیەکت بەسـەر دارێکـەوە بینی کەوتە بەر چەپۆکی ڕەشـەباکەو چۆلەکـە دایکانەکەت بینـی زەرنەقوتەکانی یەکە یەکە بە دەمەوە دەگرت و دەیویست بیانگوازێتەوە بۆ شـوێنێکی پەنا کەچی لە نێوانی ڕێگادا، یەکە

یەکـە لە دەمـی کەوتن و کەوتنە بەر رەشـەبا و دڵت بۆیان سووتا. دەرویشێکت بینی کەشکۆڵێکی بـە ملەوە بوو خۆی سـپاردبوو بـەدەم بایەکەوە و تەنانـەت گوێت لە تریقـەی پێکەنینەکانی بوو. دەتگـوت گاڵتە بە دنیا و گەمەکانی دنیا دەکات. لە پڕا برووسـکەیەک لێیدا و ئەوهەندە بە خێرایی تواندییەوە دەتگوت هەر لە بنەڕەتدا دەرویشـێک بوونـی نەبووە. تۆش بزەیەک هاتە سـەر لێوت. مام جوتیارت بینـی لە چۆمەکەوە دەرچوو، توند ئامێزی بە بنەدارێکەوە ناو لە ترسی ئەوەی نەوەکا وەکـو پووشـەکایەک، رەشـەباکە بیبـا و چیدی کەس نەیبینێتەوە، کەچی رەشـەباکە دارەکەی لە رەگـەوە هەڵتەکانـد و بە مام جوتیـارەوە بردی. "دەبـێ ئەمـە دنیایـەک بـێ و ئێمـەی مرۆڤیش تێیدا بژین یـان هەموومان ئەکتەری ناو فیلمێکی ترسـناکین و هەرکەسـەو رۆڵێـک دەبینـێ و لە شـوێنێک و بە شـێوەیەکی هەندێجـار کۆمیدی و هەندێجاریش تراژیدی کۆتایی بە بوونی دێ". رێگا پێچاوپێچەکەشـت وەکو هەموو ئـەو رۆژانەی کە

هێشــتا بینابیــت رووناک بوو دەبینـــی . پەری بە لێوەلــەرزە و بۆڵـــە بۆڵە بـــێ برانەوەکەی، خۆی فرێدایە نێو کۆخەکە و لە شوێنێکا گرمۆڵە بوو.

– ئاخر ئەوە من دەتناسم و گومانم لە ئاقڵبوونتا نیـــە داپیرەکەم. هەر کـــەس بەم وەزعەوە بتبینێ نالێ پیرێژن شـــێت بووە. بەم ســـەرماو ســـۆڵە و تۆش...

– منیش بەم دووچاوە کوێرە...

– ئاخـــر داپیرە. ئەوە گریمان ئەوان بەربوون. بەم دنیا تووشـــە ملی رێـــگا دەگرن؟! نەوەڵڵا. لە شـــوێنێکا ئۆقرە دەگرن تا دنیا خۆش بکا ئەوجا دێنەوە.. ئەویش ئەگەر..

– دڵـــی من ئـــەو ئەگـــەرەی تێدا نیـــە پەری. کچەکـــەم. دڵی من ئەمڕۆ وەک هیچ رۆژێکی دیکە نیـــە. دەڵێی باڵندەیەکە و مـــوژدەی ئەوەیان پێ داوە ئەمڕۆ لە قەفەز دەردەچێ. من ئەمڕۆ دڵنیام ئەوان دێنەوە..

– داپیـــرە.. بە قوربانی ئەو دڵەت بم. تۆ ئەم هەمـــوو ســـاڵە لـــە چاوەڕوانیـــدا وەڕەز نەبووی؟.

بــێ تاقەت نەبووی؟. ئومێد بــڕاو نەبووی؟. ئەوە سەبری ئەیوبە تۆ هەتە. یان خۆڕاگری یەعقوب. تۆ ئــەو هەندە خۆت ئازار دەدەی لە کاتێکا هەمووان دەڵێن ئەوان...

- ئەوان نەماون؟! نا، ئەوان ماون. دڵی من وا ناڵێ پەری.

هەناسەیەکی ساردت هەڵکێشا و ماوەیەکی پێ چوو تا هەناســەکەت دایەوە. پەری ترســا. ترسا لــەوەی ئەو هەناســەیەی هەڵتکێشــا نەیەتەوە و تۆ بەم سەرماوســۆڵە وشــک و رەق هەڵگەڕێیت. هەناســەکەت گەلێ ســارد بوو. هێندە ســارد بوو خەریــک بوو رۆحت بمەیەنێ. هەندێ تینت دایەوە بەرخۆت. ئاراســتەی نیگات پاشــییەوە سەر رێگا هــەزار پێچەکەی بەردەمت و لە زەینتدا گەڕایتەوە بۆ رۆژە رەشەکە.

ـ دواتر گوێم لە سعاتی سفر بوو. پێشتر بەر گوێم نەکەوتبوو. ئەو بەرەبەیانە لە چرکەســاتێکا دەتگوت بوومەلەرزەیەکی یەکجار بەهێز گوندەکەی راتەکاند. کەس نەیزانی چی روودەدا. دەنگی تەقە

و هــات و هاوار و فيــزاح و بگره و بەردەيەک بوو هەمووومان پەشــۆكاين. هــەر نەمانزانی دەبێ چی بكەيــن. لەچی و لــە كێ هەڵبێين و بەرەو كوێ و روو لە كێ هەڵبێين. هەر نەمانزانی مەترســييەكە لە ئاســمانەوەيە، لە ژێرمانەوەيە لە زەوی، لەسەر ئەرزەكەيە. نەمانزانی. وەكو شــارە مێرووله چۆن دەكەوێتــە ژێر پێی فيلێــک وامان لێ هات. ملمان دەنــا بەيەكەوە. هەمووی دەگريا. ئايەت و وێرد و دوعامان دەخوێند. سەرمان هەڵبڕيبوو بۆ ئاسمان قودرەتێک بەهانامانەوە بێت. رەوە گورگێكی كەڵب تيژ و برسی بوون تێمان بەربوون يان رەوە سەگ بوون و هار ببوون.. نەمانزانی. بەڵام هەرچييەكی بــوون، كەســێک نەبــوو چغەيەكيــان لــێ بكات، كچــم پەری.. كەس نەبوو. لە ئاســمان هەر تەنها برووسكە دەيشريقاند و هەور بێ راوەستان گرمەی لێوە دەهات. وامانزانی ئەمە رۆژی حەشــرەكەيە. ئێ بەڵام بۆ هەر ئێمە.خۆ قابيله رۆژی حەشر هەر بۆ گوندەكەی ئێمە هەڵســتابێ. ئەی بۆ كەس بە هاوارمانەوە نەگەيی. بۆ كەس وەحەيەكی لەو رەوە

گورگە نەکرد. نازانـم. بەبەرچاومانەوە دەیانگرت و دەیانکوشـت و دەیانشـێلاو دەیانپلیقانـدەوە و دەیانسـووتاند و... چوزانـم. ڕۆژێکـی ڕەش بوو. هەمووان نووسـتبوون تا ئێمـە قڕ بکرێین. کەس واگا نەهـات. کـەس ورتەی لێـوە نەهات. ئێ خۆ ئێمـە لە دوورگـەی واقواق نەبوویـن. بۆ وا تەنها کەوتینە بەر کەڵبەی ئەو گورگانە، نازانم. هەرچی نێرینە بوو بردیـان. ڕاپێچیان کرد. هەرچی کچی عـازەب و جـوان بـوو بژاردەیان کـرد و بردیان. دەستیشیان لە کەس نەپاراست. باپیرەتیان برد. باوکت. هێشـتا دەنگی باوکت لەناو گوێچکەکانما دەزرینگێتـەوە "دایە. دایە. پـەری ئەمانەتی خوا و تـۆ. پەری ئەمانەتی خوا و تۆ". دەنگی پڕ بوو لـە گریان. لە بێچارەیی. لە بێ دەسـەڵاتیی. من لەپەوڕوو کەوتبوومە سەر ئەرزەکە و هەر بە چنگم زەویم دەڕنییەوە. نەمدەزانی سەیری کامیان بکەم. فریا نەکەوتم تێر سـەیری هیـچ کامێکیان بکەم. دایکت..

قوڵپی گریان قسـەی پێ بڕیت. ماوەیەکی پێ

چوو تا رێگای هەناسەت کرایەوە..
- دایکــت، کــت و مت وەک تۆ و ئێســتات وا بــوو. باڵابەرز و باریک و جــوان. بینیم کەوتبووە بــەر پێیەکانــی یەکێک لــە گورگــەکان. هەردوو پێــی گورگێکــی لە ئامێــز گرتبــوو. دەپاڕایەوە. دەکڕوزایەوە. بە قوربانی دەبوو. عەرد و ئاسمانی هێنایە شــەفاعەت. ئەوان بە زمانی ئێمە قسەیان نەدەکرد. زمانێکی تریان بوو. ئێمە هیچ نەماندەزانی ئەوان چی دەڵێن. ئەوانیش لە ئێمە نەدەگەیشتن. نازانــم لە کوێــوە هاتبوون. ئەوســا وامانزانی لەو بەرزاییانە لە هەســارەیەکی نەدۆزراوەوە هاتوون. یــان چڵــکاوی ژێر زەوی بڵقــی داوە و ئەمانی لێ دەرچــوون. هیچیــان لە مــرۆڤ نەدەچــوو. ئاخر مرۆڤ شــەڕ دەکا، بەڵام ئاوهــا دڕندانە ناکەوێتە وێــزەی هەموو شــتێک. نا. بێ گومانــم ئەوان لە رەگەزی مرۆڤ نەبوون. بینیم، ئەو دڕندەیەم بینی بە بەرچاومەوە، دەمانچەکەی لەناو قەدی کردەوە و هەموو گوللەکانی لەناو سەری دایکت بەتاڵ کرد. پێم ســەیر بــوو. ئاخر گورگ و ســەگیش هەندێ

جار بەزەییــان دەجوولێ. کەچی ئەمانە جۆرێکی جیــاواز بوون لە ئاژەڵی دڕندە. من لە ترســا تۆم گرتــە ئامێز و هەڵاتم. ترســی ئەوەم هەبوو تۆش بکوژن. چونکە منداڵی زۆریان کوشت. خۆم کوتایە ناو مزگەوتەکە، کە نیوەی رووخێندرابوو، ئاگریشی تێ بەردرابوو. گوتم بەڵکو فریشتەکانی خوا لەوێ بــن و تکایان لێ بکەم تــۆ بپارێزن. بەڵام لەوێش نەبــوون. چونکــە هەمــوو کتێبــە پیرۆزەکانیش ئاگریــان گرتبوو و دەســووتان. پەلاماری یەکێک لەو کتێبە پیرۆزانەم دا. هەموو پەڕەکانی شــەهید ببوو، هەندێکی لێ مابوو. لێمکردنەوە و نەمهێشت بســووتێن. چەند پەڕەیەکم لێکردەوە و هەڵمگرت نەمهێشت بسووتێن. ترسام نەوەکا خوا غەزەبمان لێ بگرێ. هەرچەندە ئێمە نەمانســووتاندبوو. ئەو دڕندانە ســووتاندبوویان. بەڵام ترســام باریتەعالا غەزەب لە ئێمە بگرێ. بەڵام دڕندەکان ئاگریان لە هەموو شــتێ بەردا. تەنانەت دەستیان لە کەلامی خواش نەپاراست. بۆیە زانیم مەلائیکەتەکان لەوێش نین. پەڕەکانی کتێبە پیرۆزەکە و تۆم هەڵگرت و

هاتینە دەرێ و مزگەوتەکە بەسەریەکداڕما. رۆژێکی ڕەش بوو. گەلێ ڕەش..

دەستێکت بە حەمایلەکەی ملت داهێنا. بردت بۆ دەمت و ڕاتمووسی. دواتر گەڕاندتەوە شوێنەکەی خۆی. سەر دڵت. دەستێکی ترت بە ئارامی بەسەر داهێنا..

_ نازانم چەند ساڵ. چەند سەد ساڵ. چەند هەزار ساڵ. چەند ملیۆن ساڵی کێشا. رۆژە ڕەشەکە دەڵێم. گەلێ زۆری کێشا. وەختێ بینیم گورگەکان و سەگەکان لەوێ نەماون. باوکت و باپیرتیش نەماون. تەرمی دایکتیش لەوێ. لەسەر زگ ڕاکشابوو و سەری لەناو گۆمی خوێن چەقیبوو. سێ مامەت. چوار برای من. دوو خاڵۆت. چوزانم. هەمووی. هەموویان بردن. بۆ کوێ نازانم. لەو ساوە ساڵەهای ساڵە چاوم بڕیوەتە ئەو ڕێگا هەزار پێچەوە تا رۆژێک ببینم وا ڕێچکەیان بەستووە و یەک بەدوای یەک دا دێنەوە. رۆژانە هەر لە سپێدە زووەوە تا ئێوارە. لە کازیوەوە بۆ زەردەپەڕ. هەر چاوەڕوانم. شەوانیش ڕێگاکە لوول دەدەم لەناو

چاوەکانمدا و کاتی خەوتن رایدەخەمەوە و دیسان هــەر چاوەڕوانم. نەوەکا شــەوێک بێنەوە و ئاگام لێ نەبێ. ئیــدی نازانم ئەوە رێگایە وەکو مارێکی درێژ پەپکــەی داوە یان پێڵــووی چاوەکانی منن راکشــاون. زۆر پاڕامەوە خوا چیم لێ دەسەنێتەوە با بیســەنێتەوە بەس تەنهــا چاوەکانم بۆ بێڵێ تا چاوەڕوانیــی گەڕانەوەیــان بم. بەڵام ئەویشــم بۆ نەمایەوە.

- دەی باشــە داپیرە. کــە بینایيت نەماوە با نۆرەی گوێچکەکانت بێ. لەماڵەوە دانیشە و گوێ شل کە بۆ دەنگی دەرگا. هەر وەختێ هاتنەوە لە دەرگا دەدەن..

- نا کچم نا. نا پەری. کێشــەی من لەم چەند ســاڵە کورتە دا نیــە کە لەم دنیایــە چاوەڕوانیی گەڕانەوەیــان دەکەم. من دەبێ لەو دنیاش بەدیار رێگای گەڕانەوەیانــدا چاوەڕوانی بکەم تا قیامەت هەڵدەستێ..

پەری هەستا و گوتی: باشە داپیرە. با بە دڵی تۆ بێ. من دەچم خواردنت بۆ دێنم. دەبێ برسیت

بووبێ.

هەستت دەکرد هەوا قورسەکەی نێو سینگت نەماوە. ئیدی دڵت نەپەڵماوە. هەستتت بە سووک بوون و ئاسوودەییەکی زۆر دەکرد. ئیدی نە گوێت لە گرمەی هەور دەبوو و نە جەستەت هەستی بە سەرما دەکرد. دەتگوت باڵت لێ رواوە و مەیلی فڕینت هەیە. ئا. مەیلێکی سەیرت بۆ هەڵفڕین هەیە. تەنانەت هەستت بە شەقەی باڵەکانت کرد. سەروەختێ خۆتت بینی لە ئاسمانێکی بێ سنووردا دەفڕیت و بینایت ئەوەندە تیژە هەموو نهۆمەکانی گەردوونی تێدا جێ بۆتەوە.

دوای مردنت، تەقەڵەکانی حەمایلەکە، بە دەستی مەلای گوند کرایەوە. ئەویش ماچی پەڕە پیرۆزەکانی کرد و گوتی: ئەمە سورەتی پیرۆزی ئەنفالە لەناو ئەم حەمایلەوە و، نوور لە گۆڕی ببارێ، هەم کاتی خۆی لە سووتان رزگاری کردووە و هەم ماوەی ٢٣ ساڵە کردوویەتی بە حەمایل و لەسەر دڵی داناوە...

سـێ ڕۆژ دەبـوو کەوتبووە ناو ئـەو گێژاوەی ساتە و سات زیاتر نوقمی قوڵاییە خنکێنەرەکەی دەکـرد و هەموو ئـەو ڕێگایانەی لـێ دەبڕی، کە ئومێدی گوزەرکردنی هەناسە ڕێگە لێبەستراوەکەی لێ دەکرا. هیچ کارێک و هیچ شوێنێک ئۆقرەیان پێ نەدەبەخشی. لەسەر ترۆپکی ئەو شاخەی دەتگوت سەری ناوەتە کۆشی ئاسمانەوە، ئەوەندە خۆی بە بێکەسی دەهاتە بەرچاو، کە ڕووی لەخۆر دەکرد، فرمێسکە قەتیسـماوەکانی ناو چاوەکانی پوولەک ئاسا دەدرەوشانەوە. پێکهاتەی کەسایەتییەکەشی وا دروسـت ببوو، نەدەبوایە کێشە تایبەتییەکانی

خۆی لای کەسێک بدرکێنێ. خۆ ئەگەر نزیکترین هاوسەنگەریشی فرمێسکی لە چاوەکانیدا ببینیایە ئەوامەگەر خۆی لە شاخەکەدا هەڵدێرابوایە. دەنا ئەو عەیب و عارە بە هیچ شتێکی دیکە نەدەشۆرا. بۆیە دەبوایە دوورکەوێتەوە، دەچوو لەسەر گاشەبەردێکی لێوار ترۆپکەکە دادەنیشت و ئەوەندە لەو حاڵەتەدا، بێ جووڵە دەمایەوە، دەتگوت بۆتە بەشێک لە گاشەبەردەکە. تەنیا ترپەی دڵی دەهات و ناوە ناوە چاوەکانی دەتروکاند. نیگای تێکەڵ بە هەوا سووکەکەی نێوان عەرد و ئاسمان ببوو.

هەشت ساڵ، لە جوانترین ساڵانی تەمەنی، بەسەر ڕێگایەکدا ڕۆیی، بە ئومێدی ئەوەی کەند و کۆسپ و ناهەموارییەکانی ڕێگاکە،کۆتاییان بێ، کەچی هەر ڕێگاکەش نەما. کۆتایی پێ هات و ئەویش هەردوو پێی کەوتنە بۆشایی، ڕووی بە هەرلایەکدا وەردەسووڕاند، دەیان ڕێگا و ڕێچکە دەورەیان دەدا، دەبوون بە دەیان و سەدان و هەزاران مار و بە دەوریدا رادەکشان، نەک هەر زاتی ڕۆیشتن بەسەر هیچ کامیانیدا نەبوو

نەیدەوێرا تەنانەت بە تیلەی چاو تەماشایەکیشیان بـکات. بەس نەبوو هـەر لە ئاگاییـدا، لە خەو و بێئاگاییشـدا، هەمـان ئەو ڕێگایانـە لە تەک یەک ڕادەکشـان و دەورووبەری ئەویان دەگرت، دەبوون بە کۆلکەماری ڕەش، بۆر، چڵکن، زەرد...ژەهر لە دەمیان فیشـقەی دەهات، هەریەکە و لە شـوێنی خۆیدا ڕادەکشـا، وەک ئەوەی ماوەیەک مەشقیان پـێ کرابێ. دەتگوت سـەربازن. بە فیکەیەک "کە ئـەو نەیدەبیسـت "یـان بـە ئاماژەیـەک "کە ئەو نەیدەبینـی "هەموویان ریز دەبوون. بە سـەریان، لـە نزیک پێیەکانی ئەودا، بازنەیەکی ترسـناکیان دروسـت دەکرد. کلکیان لـە مەودای چاو و بینین دەردەچوو. پان دەبوونەوە، دەبوون بە ڕێگا. دواتر خڕ دەبوونەوە. دەبوونەوە بە مار، دەیان، سەدان، هـەزاران مار، تەنانـەت ڕەنگی وایـان وەردەگرت قەت نەیبیسـتبوو ماری بەو ڕەنگانەش هەبن. بەو چاوانەی ترس و بێچارەییان لێ دەچۆڕا، سـەیری یەک یەکیانی دەکرد. بە ئەسپایی لە دەوری خۆیدا دەسـووڕا، درزێک یـان کەلێنێکـی باریکی بەدی

دەکرد و خۆی لەناو بازنەی ئەو هەموو سەرە مارە دەردەکـــرد. ئەوجا دەچووە مەلجاکەی و لەســـەر تەختە بێ سەروبەرەکەیدا، لەسەر گازەرەی پشت لێی دەکەوت و گریانی دەهات.

رێـــگاکان ئەوەندە بوون بە مار و راکشــــابوون خەریک بوو بێزار دەبوون، ئەویش ئەو بێزار بوونەی لە فیشقەی ژەهرەکانیان و سوورهەڵگەڕانی چاوە ترســـناکەکانیان بەدی کردبوو و لە ترسان هەموو گیانـــی خەریک بوو لەبـــەر یەک هەڵوەشـــێتەوە. مـــارەکان، کە درێژییان لەمـــەودای بینیندا نەبوو، وردە وردە بە پێیەکانیدا هەڵدەکشـــان. ئەویش لە خەراپبوونی نیازیان دەگەیشت.

زۆر جـــار دەیویســـت ملی یەکێکیـــان بگرێ و سواری سەرپشتی بێ و تاوی بدا، بۆ هەر کوێی برد ملکەچ بێ، بەڵام بەر لەوەی دەستە لەرزۆکەکانی بۆ گرتنی هەر کامیان درێژ بکات، پەشیمان دەبۆوە. مارەکانیـــش پەلەیـــان بوو یەکێکیـــان هەڵبژێرێ، ئەویش لەوە بێچارەتر بوو لێکیان جیاکاتەوە.

لـــە کوێ بزانێ کامەیان لەوانی دیکە باشـــترن

و بەسەر ڕێگایەکی سەلامەتتردا بەرەو مەنزڵگەی ئۆقرەیی و ئاسودەیی دەبەن. لە حاڵ و ڕۆژی ئەودا ئەقڵ و هۆش دەکەونە سەر چۆک و بوێرییش دەخزێتە قوژبنێک. چاویش ئەوەندە لێڵ دەبێ هیچ شتێک نابینێ. مارەکان بە پێیدا هەڵدەکشان. دەیانویست خۆیان بگەیەننە قورگی و لە دەوریدا بئاڵێن. شەوەکانی ڕابردوو، تەنانەت چەند جارێکیش کە دوای نیوەڕۆ، لە مەلجاکەیدا خەو بردییەوە، ڕاچڵەکی. زۆر بە توندی ڕاچڵەکی. باش بوو لەو کاتانەدا، مەلجاکە لەو زیاتر کەسی تری لێ نەبوو. ئێسقانە لێکترازاوەکانی جەستەی تێکهەڵدەکێشایەوە و لە تەختەکەیدا وەک مار دەخزایە خوارەوە، لە جلیکانەکە، پەرداخێک ئاوی پڕ دەکرد و شتێکی بەسەردا دەخوێند و فوویەکی لێ دەکرد و بە سێ جار دەیخواردەوە، بەڵام نەیدەوێرا جارێکیتر بچێتەوە سەر تەختەکە و ڕاکشێتەوە، سەری لە خۆی سوڕ مابوو.

"بۆ؟ بۆ دەبێ من وام لێ بێ.. بۆ"؟

باوکی زۆر جار پێی گوتبوو: "کوڕم نەخەڵەتێی

پرسیاری بێ وەڵام بکەی! نەخەڵەتێی تۆسقاڵێک گومان لە قودرەتی ئاسـمان بکەی! دەرفەت مەدە ئەهریمـەن ئەو رێگایە لەبـەر دەمت راخا و بەرەو دنیای گومان و پرسیاری بێ وەڵام پەلکێشت کا.. نەکەی ها"...

قورگی وشـک هەڵدەگەڕا. ناوسەری پڕ دەبوو لە پرسیار. لە گومان.. وەک چۆن ژوورێکی داخراو پڕ دەبێ لە مێش و مەگەز.. وەختێک، بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ، خۆی لەبەر دەم ئەفسەرەکەیدا بینییـەوە:" گەورەم ئەگەر مۆڵەتم بدەی سـەرێک لە ماڵەوە دەدەم. خێزانم نەخۆشـە".. کە گوتی: "خێزانم"، کەمتر لە چرکەیەک، کەمتر لە تروکاندنی پێڵووەکانی چاوێک، هەڵوەسـتەی کرد، لێوەکانی تەتەڵەیـان کرد، بڕیار نەبـوو بڵێ: "خێزانم"! هەر ئەوەندە بڵێ نەخۆشمان هەیە.

خۆشـی نەیزانـی بۆ گوتی "خێزانم"! ویسـتی داوای لێبوردن لە ئەفسەرەکەی بکات و بڵێ:"نا.. خێزانم نا.. هەر نەخۆشمان هەیە و ئەە"... کەچی دیسـان هـەر دەبوایە وشـەی "خێزانـم" دووبارە

بکاتەوە...

باوکی دەیگوت: "کوڕم، خەتای ئەو نییە.. ئەو ژنە، زەعیفەیە.. بەستەزمانە.. بێ دەسەڵاتە...

ئەویش دەیپرسی: "ئەی ئەگەر خەتای ئەو نییە، دەبێ خەتای من بێ"!

باوکی دەیگوت: "نا کوڕم.. خەتای تۆش نییە"!

ئەویش دەیگوت: "ئەی خەتای کێیە"...

ئەوجا سەری لەناو لەپی هەردوو دەستیدا دەگوشی و بۆ جاری دووەم هاواری دەکرد "ئەی خەتای کێیە"؟!

باوکی فرمێسک لەناو چاوەکانیدا دەزا.

"بۆ دەبێ خەتای کەسێک بێ؟ زۆر شت دەبێ و دەکرێ، بەڵام خەتای کەسی تێدا نییە...

ئەویش دەیگوت: "نابێ"...

باوکی دەیگوت" دەبێ کوڕم.. تۆ بەسەر کراویتەوە.. خوا وەک تۆی بەسەر کردۆتەوە کەم بەندەی خۆی ئاوها بەسەر دەکاتەوە.. شکوربە کوڕم. ئەوە هیچ نییە.. بیر لە دوا ڕۆژ بکەرەوە..

لەو رۆژەی کە"...

بـــەڵام دایکی نا. خەفەتی حەوت ســاڵ لەناو دڵـــی دایکیدا تۆپەڵەی بەســتبوو. ئــەو دەیگوت: "ژنەکە چاوی مۆنە.. خوا دەزانێ لە کچێتیدا چەند جار خلیسکاوە. گوناح خۆ هەر لەوەدا نییە لەسەر پشت راکشــێ و ناو گەڵی هەڵزڕێن.. هەفتا و دوو چەشــنە گوناە هەیە.. غەڵەتم نەکردبێ ئەو ژنەی تۆ بــە حەفتاو یــەک گوناحدا تێپەڕیــوە کوڕم.. ئێستاش کەوتۆتە بەر نەفرین و غەزەبی ئاسمان.. ئەگینا بۆ"...

باوکیشی هەر دیگوت: "ئەوەی ئێوەش دەیڵێن و گومانی لێدەکەن چەشــنێکە لە گوناە.. خۆتان گیــرۆدەی گونــاە مەکــەن.. خەتــای ئــەو زعیفە بەستەزمانە نییە.. نییە"...

ئەویــش زۆربەی جــارەکان، قینی لــە دایکی دەبۆوە کە ئاوها بێ شەرم و بێ بەزەییانە، خێزانی ئەوی تۆمەتبار دەکرد.

کەچــی زۆر لە جارەکانیشــدا لەگــەڵ دایکیدا یەکیان دەگرتەوە. ئەفسەرەکەی مۆڵەتی دا، بەڵام

ئــەو لە چوونەوەیدا دوو دڵ بوو، هاوســەنگەرێکی لێی راما و گوتی:

- کــە مۆڵــەت دراوی بــۆ نارۆیتــەوە؟ پارەت پێویستە؟

- کەوتە ناو مێشــکی: (کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە)! بچێتەوە دەبێ بڕیارەکەی جێبەجێ بکات.

دەبێ پەنجەکانی دەستی رەپ بکات و پەلاماری پشت ملی مارێک بدات و سواری سەر پشتی بێ و تاوی بدا. ئەم چوونەوەیە وەک هیچ چوونەوەیەک نییــە. ئەویش ئــەو دڵەی نەبوو ئەوەنــدە رەق و بــێ بەزەیی بــێ. کە لەسەرکوشــنی پێشــەوەی تەکسییەکەشــدا دانیشت و پشتی دایەوە، هێشتا دوو دڵ بوو.

نیگای وەک گلۆڵە بەنێکی دەستی منداڵێکی لێهاتبــوو.وا تێکئالابــوو، نــە ســەری دیــار بوو، نەبنی. هیچ شتێکی بە دروستی نەدەبینی. لە نێو چاوەکانــی دا رەنگەکان تێکەڵ و پێکەڵ دەبوون. ترســا لەوەی هەموو ئەندامانی لەش و جەستەی،

تەنانەت هەستەکانیشی تووشی ئاڵۆزی هاتبن...

* * *



یەکەم "نۆ مانگ و نۆ رۆژ" زۆر بەتام بوو، هەر ساتێکی، هەرچرکەیەکی چێژی هەبوو، هیچ چاوەڕوانییەک بە لای ئەو، وەک ئەو ماوەیە بە تاموچێژ نەبووە، هەموو جار، کە بە مۆڵەت دەگەڕایەوە، نووکی زمانی دەخستە ناو ناوکی خێزانەکەی و گەورەبوونی کۆرپەکەی ئەندازە دەگرت. بە نەرمی دەستی بەسەر زگی خێزانەکەیدا دەکێشا. تریقەی پێکەنینی خێزانەکەی تەنیا مۆسیقایەک بوو، ماندوێتی رۆژ و شەوانی شاخ و داخەکەی لە دەروونیدا دەشۆردەوە. بەڵام کە کۆرپەکە، بەیانی زوو، بەر لە خۆرهەڵات لە دایک بوو و هەمان شەو مرد، ئارەقەیەکی سارد، لە بن تووکەکانی پشتی سەرییەوە زا و وەک دڵۆپە تیزابێک بەسەر بڕبڕەی پشتیدا خلیسکا و سووتاندی...

تەنیا دانیشت و ئارام ئەژنۆکانی لە ئامێز گرت

و چاوەکانی تێبڕییە شـــوێنێک نەیزانی کوێ بوو. ماوە یاســـاغەکەی لێ بوو بـــە تەمەنێک. لێی بوو بە زەمەنێکی بێکۆتایی. کە تەواو بوو و ســـەر لە نوێ لەتەک خێزانەکەیدا راکشـــا، گوتی: "خەفەتی پێـــوە مەخۆ!باوکـــم دەڵێ ئەوەی یەکـــەم منداڵی بمرێ، خوا خۆشـــی دەوێ! با ئەمەیان پێشـــباری قیامەتمان بێ"...

هـــەر ئەو شـــەوە، بـــەر لەوەی بچێتـــە ژووری نووســـتن، باوکی ئامـــۆژگاری کرد "کـــوڕم وریابە، هەردووکتان بە دڵی پاک و نییەتی پاک و لەشـــی پاکـــەوە ئاوێتـــە بـــن.. بـــا ئەهریمـــەن لەگەڵتاندا رانەکشـــێ. ئەو زەعیفەیەش با ئەو نووشـــتەیە لە خۆی نەکاتەوە"!

ئەویـــش، خێزانەکـــەی رووت و قووت کردەوە. وەک خـــۆی. نەبـــادا جلێکی پیســـیان لەبەردابێ. تەنیا نووشـــتەکە بوو وەک ملوانکەیەکی سەوز لە گەردنـــی بلووریني خێزانەکەیدا، بەســـەر ســـینگە سپی و شووشەییەکەیدا شۆڕ ببۆوە نێوان هەردوو مەمکی، ئەویش لـــە کاتی ئاوێتەبووندا چەند جار

ماچی گۆپکی مەمکەکانــی خێزانی کرد، ئەوەندە جارەش نووشتەکەی زیارەت کرد.

تەزوویەکی خۆش گەڕاندییەوە ســەر کوشنی پێشــەوەی ناو تەکسییەکە. ســەیرێکی ڕێگاکەی کــرد، کە لــە ژێر تایەکانــی تەکســییەکەدا وەک ڕەشەمارێکی زەبەلاح راکشابوو.

مووچرکــەی ترســێک وای لێکــرد هەنــدێ خــۆی خڕ کاتەوە. بە گۆشــەی چاو ئاوڕێکی لای شــوفێرەکەی دایەوە و وەکو کیســەڵێکی ترساو، سەری خۆی بردەوە نێو پێستی و ئارامی گرت.

* * *

کــە "نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ"ی دووهەمیش تێپەڕی و منداڵی دووەمیش بە چارەنووســی یەکەم ڕۆیی، دڵی گوشــرا، گەڕایەوە دواوە، پێیان گوت: "دیارە بــەر لە ژنهێنان خلیســکاوی! بزانــە ئەهریمەن لە خشتەی بردووی، تخوونی ئافرەتێک، ئاژەڵێک یان هەر شتێکیتر کەوتوویت"! ئەوەندی هێنای و بردی هیچــی بە خەیاڵــدا نەهات، باوکــی گوتی: "کوڕم

گوێ بەو قسانە مەدە، ئەوە ئیرادە و مەشیەتە و هیچی تر نییە"!

لە دوای کۆتاهاتنی ماوەی یاساغ، لە راکشانیدا لەسەر سینگی خێزانەکەی، نووشتەیەکی دیکەشی کەوتــە بەرچاو، هەرچەندە حەزی لێ بوو، چالاَیی نێــوان هەردوو مەمکــی خێزانەکەی بلێســێتەوە، بەلاَم زاتی لادانی نووشــتەکانی نەکرد کە ئەوێیان لێی داگیر کردبوو.

* * *

یەکێــک لەو ســێ نەفەرەی لەســەر کوشــنی دواوەی تەکسیەکە دانیشتبوو گوتی:

– ئامۆزا رەحمەت نەبێ راگرە.. سەرو دڵم تێک دەچێ.

ئۆتۆمبێلەکە دایە کەنارێک و راوەستا. دیمەنی چۆڵەوانییەکەی نێوان عەسر و خۆرئاوای جوان و دڵگیر هاتە بەرچاو.

هەموویان دابەزین، هەر یەکە و بەلایەکدا رۆیی. دوای کورتە ماوەیەک گەڕانەوە، سوار بوون و هەر

کەســـە و لە جێگای خـۆی دانیشـتەوە، هاوکات لەگەڵ وەجووڵە کەوتنـــی ئۆتۆمبێلەکە، ئەوانیش بە شۆفێرەکەشەوە، نوقمی ناو دنیای خەیاڵاتیان بوونـــەوە، لەیەکـــەم هەناســـە هەڵکێشـانیاندا، هەموویان هەستیان بە بۆنی میز و رشانەوە کرد و کەمێک دەموچاویان تێکچرژا.

* * *

لە سـێیەم سـکپڕبوونی خێزانەکەیدا، کەوتە پاڕانـــەوە. کاری رۆژ و شـــەوانەی ئـــەوە بوو هەر بکرووزێتەوە، زۆر جاران دەیبینی، باوکی لەســـەر بەرماڵە حەوت رەنگەکەیدا، نیگای ئاوێزانی بنمیچی ژوورەکە کردووە و ئەویش خەریکی پاڕانەوەیە.

هەمیشە دەیبینی لە دوای نوێژەکانیدا، روو لە قیبلە دادەنیشێ و هەر منگەی دێ. دەیزانی باوکی خەمـــی بۆ دەخوا و نزای بـــۆ دەکا. لە قودرەتێک دەپاڕێتـــەوە کـــە ئیـــرادە و مەشـــیەتەکە لەوێـــوە سەرچاوە دەگرێ. خۆشی بەردەوام لە دانیشتندا، لە خەوتن و بێداریدا، لەڕێگادا بەدەم رۆیشتنەوە،

بەتایبەت ئەو ساتە پڕ لە تەنیاییانەی دەبوایە، لە تاریکایی شەوانی ئەنگوستە چاودا، ئێشک بگرێ.. هەر دەنووزایەوە.. دەپاڕایەوە.. سەری هەڵدەبڕی، لە یەک یەک ئەستێرەکان، کە وەک هەزاران هەزار پوولەکە بە سـینگی ئاسـمانەوە دەدرەوشانەوە، رادەما.. نیگای، زێتر لەسـەر ئەستێرە گەشەکان هەڵوەستەی دەکرد، لەوانیش دەپاڕایەوە. قورگی پڕ دەبـوو لە گریـان. گەرمایی فرمێسـکی لەناو چاوەکانیدا هەسـت پێدەکرد و ئاسـوودە دەبوو. پێـی وابوو گریانی پیاو، لـە تەنیاییەکی تاریکدا، دەکرێ بەزەییەک بجووڵێنێ.

بـەڵام دایکی!.. ئـای لەو کانیاوە شـێلووەی چاوەکانی دایکی.. ئای لەو روخسارە ترشوتاڵەی دایکـی، کە دەتکـوت قوزەلقوڕتیان لـێ دەبارێ. دایکـی بۆ دەبێ ئاوەها نائومێد بوو بێ؟ ئایا ئەو شـتێکی دەزانی ئەوانیتر لێی بـێ ئاگابوون؟ ئایا نهێنییەکـی بووکەکەی چنگ کەوتبوو؟ لەناو نیگا تەڵخەکانی دایکیدا، کزترین تروسکایی ئومێد بەدی نەدەکرا...

ئایا دایکی، ئومێدی بە قودرەتی ئاســمانیش نەمابــوو؟.. ئەو زۆر لە دایکــی رادەما. هەرچەند زیاتر لێی رادەما، زیاتر دڵی دەگوشرا.

"دایە.. دایە گیان! دەپێم بڵێ بۆ خاتری خوا.. پێم بڵێ مەســەلە چییە؟ هەر تەنیا بەدگومانییە، کەوا هەموو دەروونتی داگرتووە یان لەناو سندوقی دڵتدا نهێنییەکت حەشــارداوە؟ بە کورەکەت بڵێ دایە.. هیچ نەبێ تۆ.. تۆ بەزەییەکت پێمدا بێتەوە.. پێم بڵێ ئەم جارەیان.. ئەم سکەی بۆمان دەمێنێ دایە؟ ها؟ دەمێنێ؟

دایکی رووی لێی وەردەچەرخاند:

"ژنەکــەت.. هەمووی لە بن ســەری ژنەکەتە.. کــێ دەڵێ بەر لەوەی ببێتە ژنی تۆ، کەســێکیتر، پیاوێکیتــر چــاوی لــێ نەبــووە و ئێســتا دوعا و نووشتەی لێ نەکردووە. کێ دەڵێ حەز و حەزداری لەگەڵ کەســێکدا نەبووە.. ژنەکەی تۆ، لەبەر هەر چییەکی بێ کەوتۆتە بەر غەزەب و نەفرینی ئاسمان کورم.. تۆش دەبێ بە ئاگری ئەو هەڵقرچێیت"...

لــە قســەکانی دایکیــدا تەنیــا بۆنێــک لــە

بەدگومانـــی هەبـــوو و هیچیتر.ئـــەو خێزانی خۆی خۆش دەویست. تا ئەوپەڕی خۆشی دەویست. لە شەوانی شـــاخوداخدا و لە ساتەکانی ئێشککگریدا، جزدانەکـــەی لە گیرفانـــی دەردەهێنـــا، دەقەکەی دەکردەوە و ئەوەندە لە وێنەی خێزانەکەی رادەما، تا نیگای لە تاریکایی رادەهات و تارمایی وێنەکەی دەبینـــی، ئەوجـــا ئارام و هێدی، ســـەرپەنجەکانی دەســـتی بەسەر وێنەکەدا دەکێشا و دڵی ئاسوودە دەبـــوو. هەموو جارێکیش لەماڵئاوایی کۆتا هاتنی مۆڵەتـــی و، لـــە گەڕانەوەیدا بۆ ماڵـــەوە، جارێک فرمێسکی لێکترازان و جارێکیش فرمێسکی خۆشی و شـــادی، لە ناو چـــاوە هەنگوێنییەکانی خێزانیدا بەدی دەکرد، دەیزانی خێزانەکەیشی ئەوی خۆش دەوێ بەڵام دایکی.. دایکی خەریک بوو تۆوی رق و نەفرەتی لە دڵیدا دەچاند.

ئـــەو جاریـــش، کـــە گەڕایەوە، یەکـــەم کەس، دایکـــی بینی وەک کوندەپەپۆ، لە دیوی دەرەوەی دەرگای حەوشـــەدا، لەسەر ســـەکۆ گچکەکەی بن پەنجـــەرەی ژووره روو لـــە کۆڵانی ئەوانەوە، خۆی

مـــات دابوو، وەک ئەوەی چاوەڕێی گەڕانەوەی ئەو بوو بێ و زوو ئەم هەواڵەی پێ بدا.

"ئەوەش سـێیەمین، کوڕم.. هەموو شتێکیش لە سێهەمیندا دەبڕێتەوە. سێهەم کۆرپەشمان بۆت ناشت. تۆ ژنت هێناوە قەبرستانت بۆ ئاوەدان بکا، یان چرایەک بۆ وەجاخت هەڵکا؟ دەست و بردێک بۆ خۆت بکە تا شتێکت تێداماوە"...

بە بێدەنگی، گوێی بۆ دایکی شل کرد، سەری بەردایەوە و نیگای بە بەژنیدا شۆڕ بۆوە، هەر بەو بێدەنگییەش خزایە ژوورەوە، باوکی هێشتا لەسەر بەرماڵەکەی دانیشتبوو.

هەسـتی کـرد دوعـا و نزاکانی باوکـی، وەک ئەو مێشـانە بە بنمیچەکەوە دەنووسێن کە لە پار هاوینـەوە، کەس هیمەتی لادانیانی نەکردووە: "تۆ لە تاقیکردنەوەدای کوڕم! وریای خۆت بە! دۆڕاندن و دەرنەچوون لە تاقیکردنەوەی ئیرادە و مەشیەتی ئاسـمان، یاخـی بوونە لـەو ئیرادە و مەشـیەتە، ئەویش ڕەگی لەدۆزەخە"...

بۆچوونەکانـی باوکـی، تـا ڕادەیەکـی کەم،

یەکجار کەم، دڵی ئارام دەکردەوە، بەڵام لە بیابانی مێشکیدا، ئەوەندە پرسیاری بێ وەڵام، وەک دڕکوداڵ روابوو، گەیاندبوویانە سەر سنووری شێتبوون.

"بۆ .. بۆ زیاد لەو هەموو مەخلووقە دەبێ من تاقی بکرێمەوە؟ کەی تاقیکردنەوە ئەوەندە ئەستەم و دژوار بووە؟ بۆ دەبێ من بەسەر بکرێمەوە؟ نامەوێ.. نامەوێ"...

باوکی بە هانای دەهات: "دەرفەت بە ئەهریمەن مەدە پەلکێشی رێگەی گومانت بکا، کورم"!

هەموو دکتۆرەکان گوتیان، کۆرپەکان، وەک هەر کۆرپەیەکی ساخڵەم لەناو سکی دایکیاندا گەشە دەکەن و ئاسایی لە دایک دەبن و مردنیشیان لە دەسەڵاتی کەسدا نییە. ئەوانیش گوتیان مردنی کۆرپەکان لە ئیرادە و مەشیەتێکی بەرزتر لە دەسەڵاتی ئادەمیزادەوەیە. کەوتنە گەڕان بۆ دۆزینەوەی هۆکارێک رێگەی پەیوەندی لەگەڵ ئەو دەسەڵاتە نادیارەدا هەموار بکات.

لە دوای ئەوەی نزا و پاڕانەوەی هەموویان

وەک مێشــە وشک بووەکان بە بنمیچی ژوورەکەدا نووســان و هەورازتــر هەڵنەکشــا، دەبوایە بیر لە ڕێگــە و چارەیتر بکرێتــەوە. بەردێکی خڕ و پانی ماڵە شێخێکیان لە پەڕۆیەکدا ئاڵاند و وتیان دەبێ ژنەکە چل شــەوی بێ بڕانەوە لە کاتی نووستن و تەنانەت لە کاتی جووتبوون لەگەڵ مێردەکەیشیدا، لەســەر رووتەی ســکییەوە ببەســتێت و بەردەکە بکەوێتە سەر ناوکییەوە.

دواتریش، تەنەکەیەک ئاوی لەسەر خوێندراوی فوولێکراوی ســەیدێکی ســەر و ناو قەد ســەوز و موبارەکیان هێنا و وتیان دەبێ هەر ژەمەی بەر لە نان خواردن، هەموو شەوێکیش بەر لە چوونە سەر جێ، پەرداخێک لە ئاوەکە بخواتەوە.

دواتــر ناونیشــانی ئیمامزادەکــەی دەرەوەی شاریان داپێی، کە خۆی خەڵکی وڵاتی یەمەنستان و ئەو ناوە بووە و خوا نەبێ کەس نازانێ بۆ ڕێگەی کەوتــە ئەم دەڤــەرە و لە غەریبیدا خانەخوێیەکی خوانەناس، خۆی و حوشترەکەی دەرمانخوارد کرد و هەردووکیان بردن لە دەرەوەی شار ناشتیانن و ئەو

ئیمامزادەیە ئەوەندە دڵپاک و لە خواترس بوو، ئەو کارە ناپەسەندەی خانەخوێیەکەی بە دڵ نەگرتووە و نەخۆش و بیمار و ئارەزوومەندان رووی تێدەکەن و ئەویش کەس بە بێ مورادی ناگەڕێنێتەوە، گوتیان دەبێ سێ شەوی چوارشەممان، لە خزمەت ئەو ئیمامزادەیەدا رۆژ بکاتەوە و رێگەیان دا مندالێکی نابالق لەگەڵیدا بێ. ئەو کاتەی خۆری چوارشەممەی سێیەم هەڵدێ، با تیزمالێک لە ئالا سەوزەکە بدڕێنێ و بە بەرۆکییەوە ببەستێ.

هەمووشیان ئامۆژگاریی خۆی و مێردەکەیان دەکرد نەبادا، تۆسقالێک گومان لەو کارانە بکەوێتە دڵیان، ئەو تۆسقاڵ گومانە هەموو متفەڕکی و لێ خوێندن و فووە موبارەکەکان دەسڕێتەوە. شەوان، کە دەیبینی سینگ و مەمکی خێزانەکەی، کە ئەوەندەی حەز بەلێستنەوەیان بوو نەبێتەوە، لە بن نووشتە سێ گۆشە و چوار گۆشە و بازنەییەکاندا ون بووە، کۆڵێک خەفەتی دەخوارد. وایدەزانی کەسانێک، چەپۆکی داگیرکارییان لەسەر سینگ و مەمکی خێزانەکەیدا چەقاندووە و ئەویش زاتی

لادان و تەنانەت بەدگومانیشـــی لـــە بەرامبەریاندا نەدەکرد.

بردیانە شـــارێکی دیکە و ژنەیـــان ناچار کرد، دار و دیـــواری مەزارگە پیرۆزەکەی ئەوێ بە زمان بلێســـێتەوە و خـــۆی پێـــدا هەڵخشـــێنێ. لـــە دوا هەوڵداندا پەلکێشی لای شێخێکی نوورانییان کرد. ئەویش دەستی پیرۆزی خۆی بەسەر رووتەی سکی ژنەکـــە داهێنـــا و برد و فەرمـــووی "جنگیر کراوە، لەمە چێترانیان راســـپاردووە هەموو جار کۆرپەکە بکـــوژن، ئەگەر دیقەتتان دابـــێ هەموو کۆرپەکان خنکێندراون".

دایکی زوو هەڵیدایەو گوتی: "وایە یا شێخ! من خـــۆم جێ پنجەکانی لەمەچێترانم لەســـەر قورگی هەموویاندا دیتووە، بەڵام دەنگم نەکرد نەبادا"..

شـــێخ فەرموویەوە: "ئەو ژنە دەبێ چل شەو و چل ڕۆژ لە تەکیەی ئێمەدا بمێنێتەوە".

پێی ناخۆش بـــوو، هەرچەندە هیچ گومانێکی بەدی نەکرد لە روخســـاری درەوشـــاوەی شـــێخدا، بـــەڵام بەلایـــەوە زۆر ئەســـتەم بـــوو، خێزانەکەی

چل ڕۆژ، دوور لە خۆی و لە ناو کەسانێکی تردا بمێنێتەوە. ئەشیویرا رەتی بکاتەوە. نیگایەکی ئەم و نیگایەکی ئەوی کرد. ویستی بە ئیمازەی نیگایەکیش بێ، خێزانەکەی حاڵی بکا، بەم مانەوەیە رەزا نییە.

دایکی گوتی: "باشە.. با بمێنێتەوە".

باوکی گوتی: "لاحەولە وەلا ..."

ژنەکەش گۆشەچاوێکی تێبڕیە مێردەکەی و لێی حاڵی بوو.

گوتی: "نامێنمەوە"

ئەویش گوتی: "با نەمێنێتەوە".

لە دوای مەرگی کۆرپەی چوارەم، لە قوژبنێکی ژوورەکەدا گرمۆڵە بوو، کپ و مات و بێدەنگ، ئەژنۆکانی لە ئامێز کرد و دانیشت، ژنەکەش لەولاتر، وەک ئەو، لەناو ژان و چارە رەشییەکەیدا گرمۆڵە بوو و وەک پەیکەرێکی بێ گیان، بە دیوارەکەوە نووسا.

- دایکم دەڵێ تۆ ژنێکی غەزەبی و نەفرین لێکراویت!

- دایکـی منیـش دەڵێ مێردەکـەت پیاوێکی غەزەبی و نەفرین لێکراوە!

- دایکم دەڵێ تۆ.. تۆ بەر لەوەی ببیتە خێزانی من...

- خلیسـکاوم؟ گوناحـم کـردووە؟ پیاوێکیتر تخوونـم کەوتـووە؟ هێلانـەی پەڕەسـێلکەم شـێواندووە؟ حەز و حەزداریم کردووە؟ بە لەشی پیسەوە بە بن دیواری مزگەوتدا رەت بووم؟ شەوان بە رووت و قووتی لە باخەڵی جنۆکە و لەمەچێتران راکشـاوم؟ دایکت هەموو ئەوانە و شتی دیکەیشی پێـم گوتـووە. لە بیـری چووە بەر لـە مارەبڕینم دراوسـێ و ماڵە گەڕەک نەما پرسی پێ نەکەن و خۆی گوتی هەموو خەڵکی گەڕەک گەواهی ئەوەیان داوە ئـەو کچـە، پەپوولەیە لە پاکیـدا و خاتوونە لە نەجیبیدا.. دایکت لە بیری چووە بەیانییەکەی یەکەم شەوی بووکێنیم، پەڕۆ سپییە خوێناویەکەی ژێرمی بەدەسـتی خۆی هەڵگـرت و ماچی کردم. ماوەیەکـە، ئـاگادارم بۆچوونەکانی دایکت کاریان تێکردووی و دڵ و مێشکتیان داگیر کردووە. گرنگ

ئەوەیە خۆت دەڵێی چی؟

- مــن؟ من دەڵێم.. ڕێگام بدە با ژنێکی دیکە بێنم...

- ڕێگادانی منی بۆ چییە؟ تۆ سەدان ساڵ بەر لە ئێستا ڕێگەت پێ دراوە.

- من ئەو ڕێگایەم گەرەکە تۆ پێمی بدەی...

- مــن ئەوەنــدەم لەســەرە کۆرپەکانــت بــە زیندوویی و بە ساغڵەمی بۆ فرێ بدەم! لە توانای مندا نییە ڕێگە لە مردنیان بگرم.. کە گوناه لە من نەبێ ڕێگەشت نادەم ژنێکی تر بێنی...

- کەوا بێ ناچارم...

- تەڵاقم بدەیت؟

- ئا...

- قەینا.. بەڵام ژنێکی تر بێنی، نا...

پێنجەم کۆرپ لە تەک ئەوانی دیکەدا هەڵکەندرا.

ســاڵی دواتر، شەشەم کۆرپەش مرد. خێزانەکەی بردەوە لای شێخە نوورانییەکە و گوتی:

"بــا چل شــەو و چل ڕۆژ لە تەکیــەی ئێوەدا بمێنێتەوە"

لە ماڵەوە، چەند ساتێ لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا وێستا، بە وردی لە خۆی ڕاما.

"ئــەی کوا.. کوا مــن؟ کوا منی جــاران، ئەو هەمــوو لۆچــە! ئەو قژە ســپی هەڵگــەڕاوە! ئەو دەموچــاوە تێکشــکاوە! ئــەو دوو چــاوە خوێن و فرمێســک تێزاوە! ئەو هەموو شەکەتی و خەفەتە چییە بەسەر و سیمامەوە؟ بۆ وام لێهات؟کوا من؟ کــوا منی جــاران؟ کوا ئەو منەی شــێوەی مرۆڤم هەبوو"؟

* * *

یەکێــک لەو ســێ نەفەرەی لەســەر کوشــنی دواوەی تەکسیەکە دانیشتبوو گوتی:

– ئامــۆزا ڕەحمەت نەبێ ڕاگرە.. ســەر و دڵم تێک دەچێ...

لــە لێــواری جادەکــە ڕایگــرت. هەر کەســە و بەلایەکــدا پــەرت بــوو. کە ســوار بوونــەوە و ئۆتۆمبێلەکە، کەوتە ڕێ، هەموویان هەســتیان بە بۆنی میز و ڕشانەوە کرد.

* * *

چل شـــەو و چل ڕۆژەکە تەواو بوو. ڕۆیشت و دەســـتی خێزانەکەی گرت و لە تەکیە پیرۆزەکەدا هێنایەوە ماڵەوە. جار بە جارێ بە بەدگومانییەوە، لە چـاوە سیســەکانی خێزانەکـەی ڕادەما. وەک ئــەوەی چاوەکانی، هەنگوێنە جوانەکەی جارانیان تێدانەمابێ. هەر بەو بەدگومانییەوە لەسەر سکیدا ڕادەکشـا، ژنەکەش هەســتی بەوە دەکرد گومان لەناو نیگا ماتەکانی مێردەکەیدا دەتکێ. دەیبینی ئەهریمەن لەناو چاوە ڕەش و گەشـــەکانی جارانی مێردەکـــەی هێلانەی کـــردووە. ئـــەم جارەیان کە ســکی خێزانەکەی ئاوسا، ئەو لە دڵی خۆیدا، ئەم ئاوســانەی بەدوا جار و دوا مۆڵەت دانا، بەڵام لە دوای مانەوەی ژنەکە، بۆ ماوەی چل شـــەو و چل ڕۆژ، لـــەو تەکیـــە پیرۆزەدا و تارومـــار کردنی ئەو جنۆکە و لەمەچێترە زاڵمانەی ئەو کۆرپە پەپوولە ئاسایانەیان دەخنکاند، هێندەی تۆسقاڵێک ئومێد لەبـــن و بنی دڵی هەموویاندا بـــەدی دەکرا، بەڵام

ئەو ئومێدە قەت ئەوەندە نەبوو، هەڵکشێ و بزێتە ناو چاوانیان.

ئێستاش کە ئەو لە کوشنی پێشەوەی تەکسیەکەدا، پشتی داوەتەوە و بەرەو ماڵ دەچێ، بە پێی هەموو ژمارە و حسێباتەکان، حەوتەم و دوا کۆرپەیە، دەبووایە سێ رۆژ پێش یان دوێنێ، یان هیچ نەبێ ئەمڕۆ، چاوی بەدنیا هەڵێنابێ. لە جامی پێشەوەدا چاوی لە جادەکە بڕیبوە کە لەناو لێڵیی دەمەوئێوارەیەکی درەنگە وەختدا، وەک کۆڵەمارێکی رەش، تا دەرەوەی مەودای چاو، راکشابوو، دواتر بوون بە دوو مار.. دەمار.. سەد مار.. هەزار مار...

"ئەگەر ئەمەشیان مردبێ"

مارەکان جووڵەیان تێکەوت.

"ئەگەر ئەمەشیان مردبێ".

یەکێک لە مارەکان، کە لەوانی دیکە گەورەتر بوو و لە دوو گۆشەی سەرەپانەکەیدا، دوو قۆچی هەبوو، سەری قیت کردەوە، ئەوانی دیکەش وەک ئەویان کرد.

"ئەگەر ئەمەشیان مردبێ"؟

مـارەکان بـە لمـووز و جامـی پێشـەوەی ترۆمبێلەکەدا هەڵکشان، چاویان وەک دەنکە هەنار سوور بوو. مرۆڤیان هەراسان دەکرد.

"تەڵاقی بدەم"؟

مارەگـەورە سـەرپانە قۆچدارەکـە، ژەهرێکی زۆری، بە زمانە دوولکەکەی فیشقاندە سەر جامی پێشـەوەی ترومبێلەکـە. راچڵەکی و لە ترسـان، جیرەی بە کوشنەکە خست، بەڵام گوێی لێ نەبوو، کە شوفێرەکە گوتی: چی بوو؟

نەشیبینی کە شوفێرەکە هەندێک لێی راما.

"بێ پرسی ئەو ژنێکی دیکە بێنم"؟

سـەری دایکی لەسـەر جەسـتەی یەکێک لە مارەکان بینی کە وتی: "ئا. ئا کورم".

"هەروا بەردەوام بین لە کۆرپە ناشتن"؟

مارە گەورەکە بە دوای درزێکدا دەگەڕا، زمانی بکاتە ژووری ئۆتۆمبێلەکەوە.

"خۆم شێت بکەم و بکەومە دنیاوە؟ بیکوژم؟ خـۆم بکوژم؟ دایکم بکوژم؟ ئەی ئەگەر هیچ یەک

لەوانــە نەکەم، چنگ لە کوێ، لە یەخەی کێ گیر بکەم؟ لە یەخەی کێ؟.. کێ"؟...

- من!

ئاوڕێکــی دواوەی دایــەوە، یەکێــک لەو ســێ نەفەرەی لە کوشنی دواوەی تەکسیەکە دانیشتبوو، روو لە شوفێرەکە، دووبارەی کردەوە:

- من بووم گوتم دابەزین هەیە...

دەیان، سەدان، هەزاران مار بە هەزاران شێوە و هــەزاران رەنگ.. ببوون بە هــەزاران رێگای بێ بڕانەوە. درێژتر لە مەودای چاو.. درێژتر لەمەودای چنــگ لێگیرکــردن... هەموو رێــگاکان ببوون بە مار.. هەموو مارەکان ببوون بە رێگا...

کە لە بەرامبەر کۆڵانەکەی خۆیان لە تەکسیەکە دابەزی، دنیا تازەکەوتبووە نێو تاریکایی ئێوارەوە. چەنــد ســاتێک لە شــوێنی خۆیــدا، بــێ جووڵە وێســتا. ســەری هەڵبڕی و نیگای لە پێش خۆی بــە کۆڵانەکــەدا بە ڕێ کرد. لەبــەر دەمماڵەکەی خۆیانــدا، تارماییەکی گرمۆڵە کــراوی بەدی کرد، وەک کوندەپەپــۆ، لــە دیــوی دەرەوەی دەرگای

حەوشەدا، لەسەر سەکۆ گچکەکەی بن پەنجەرەی ژووره روو لـە کۆڵانی ئەوانەوە، خۆی مات دابوو، وەک ئەوەی لە چاوەڕوانیی هاتنەوەی ئەودا، خۆی مەڵاس دابێ...

ئەو رۆژەی بە یەکجاری لەبەر چاوان بزر بووم، سـپێدەیەکی فێنکی نێوان بەهار و هاوین بوو. لە دەسپێکی رۆژێکی خۆش دەچوو. ئەگەر بڕیارەکە، لە دەسـت خۆم بوایە، بێشـک، ئەو رۆژە خۆشەم هەڵنەدەبژارد بۆ بزر بوونم. نازانم ئەو رۆژە چەند شەممە بوو. ناشزانم چەندی چ مانگێکی چ ساڵێک بـوو. ماوەیـەک بـوو دەزوولـە دەمارەکانـی ئەو بەشەی مێشـکم، کە تایبەتە بە لێکهەڵاوێرکردنی ژمـارەکان، لـە کار کەوتبـوون. بۆیە چـی ژمارە هەیە، هەمووی لەناو سندووقی سەرمدا سەراوبن و تێکەڵ دەبوون. هەر تەنها ئەوەندەم لە بیرە، وەک

هەمـوو بەیانییەکانیتر، لەناو پێخەف هاتمە دەرێ و چوومــە بەر دەم ئاوێنەی ئــەو مێزتوالێتەی لە قوژبنی لای راســتەی ژووری خەوتنەکە، دانرابوو. کتوپڕ بۆ ساتێک حەپەسام. دەتگوت دەستێک، لە نێو فەزای شوێن و کاتدا بە خێراییەکی زۆر فڕێی دامە دەرێ. دەتگوت ئێستا لە هیچ شوێن و لەناو هیچ زەمەنێکدا نەبووم.

– سەیرە.....

ناو ســەرم پڕبوو لە هەوایەکــی قورس. لەوە دەچوو هەوای ترس بێ. ترســێکی زۆر خەســت و بێ کۆتایی. هەندێک لە بەردەم ئاوێنەکە، لاچوومە ئەولاتر، دیسان گەڕامەوە بەردەم ئاوێنەکە

– ئەی کوام... کوا من...

من لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا وەستابووم، کەچی ناو ئاوێنەکە، بەتاڵ بوو. منی تێدا نەبووم. هەندێ چاوەکانم هەڵگلۆفت. ترسام لەوەی نەوەکا کتوپڕ کوێــر بووبێتم. بەڵام نا. ئــەی ئەوە نیە ئاوێنەکە دەبینم. بەڵام خۆم لەناویدا نابینم. دەبێ ئاوێنەکە کوێر بووبێ و کەس لە ناویدا رەنگ نەداتەوە. نا،

ئەی ئەوە نیە شتەکانی ژوورێ، ئەوانەی دەکەونە بەرامبەری، لە ناویدا رەنگیان داوەتەوە. قوڵپێکی گریان هات و لە ناوەڕاســتی قوڕگمدا قەتیس ما. دەســتێکم بەســەر جامی ئاوێنەکەدا کێشاو دڵنیا بــووم لــەوەی کــە، من لــە بەرامبــەر ئاوێنەکەدا وەستاوم.

میتــرا هەمیشــە دەیگوت "لــە عەمرمدا پیاوم نەدیوە هێندەی تۆ هۆگری ئاوێنە بێ..ئەح"!

دەبــێ ئاوێنەکــە لێم بێــزار بووبــێ و بڕیاری دابــێ، یــان وا خۆی رێکخســتبێ، منــی لەناو دا دەرنەچــم؟ ئەمــە بیرکردنەوەیەکــی ئەوپــەڕی گاڵتەجاڕییە. ئاوێنە، پارچە جامێکی شووشــەییە لەناو چوارچێوەیەکی داردا. بڕیار و خۆڕێکخستنی لە کوێ بوو.

لەم دواییانەدا، لەوەتەی وەکو کاڵایەکی مودێل بەسەرچوو، فڕێ درابوومە ماڵ، هەموو کەسەکان و هەمــوو شــتەکانیش لەگەڵمدا کەج و ناســازگار ببــوون. ئەوەنەبــێ هــەر ئاوێنەکەبــێ، میترا، لە هەموویــان خراپتر. بــەردەوام پەڵپی بە ئاخاوتن

و رەفتــار و وردتریــن جووڵە و بزاوتــم دەگرت و هەرچییەکی بمگوتبا و بمکردبا، ئەو "ئەح"ێکی بۆ هەبوو.

جـاری وابـوو برسـێتیی، راکێشـی ژووری چێشـتلێنانی دەکـردم تـا هیچ نەبـێ بۆنێک بە خواردنەکەوە بکەم، کەچی میترا بۆڵەی دەردەچوو "ئـەرێ کابـرا دەلاچۆ لەبـەر دەسـت و پێمان با چێشتەکە لێنێین. ئەح"!

یـان بمگوتبا "پـەری، کچەکـەم. چایەکم بۆ ناهێنـی بابە". هەمدیس میتـرا دەنگی هەڵدەبڕی "ئـەرێ ئێسـتا کەی وەختـی چایە کابـرا. پەری دەرسـی هەیە و کەسیشمان دەستمان بەتاڵ نیە. تێرچا خواردنەوە نابی. ئەح"!

یـان لە هەر ژوورێک دانیشـتبام، دەتگوت بە ئانقەسـت وا دەکەن، دەهاتن رێـک ئەو ژوورەیان گەسـک دەدا و میترا پرتەی بـەرز دەبۆوە "ئەرێ دەهەسـتە بچۆ حەوشـە نەختێ، با نـاو ماڵەکە گەسـک دەیـن پیاوەکە. تـۆز و دووکەڵی جگەرە خنکاندمانی. ئەح"!.

کەچی من جگەرەیشــم نەدەکێشــا. بەڵام هەر وای دەگوت.

ئەگەریش بێدەنگ و بێ جووڵە، پشتم بدابایە دیوار و متەقم لەخۆم ببڕیبایە، هەمدیسان دەنگی میترا بـــەرز دەبۆوە بە ناڕەزایی "ئەرێ کابرا بۆ وا دەمانترســێنی. ئاوها بێدەنگ دانیشتوویتە دەڵێی مردوویــت. دە هیچ نەبــێ دەنگــێ.. جووڵەیێ.. ئحمێ.. ئەح !

ئیدی منیــش لە "ئەح"ەکانی میترا راهاتبووم.

ئەم پاییزەی دابێ، تەمەنی هاوژیانیی من و میترا فـــوو لە بیســـت و پێنجەمین مـــۆم دەکات. ئەگەر خوردی بکەمەوە دەکاتە نۆهەزار و ســـەد و بیست و پێنـــج رۆژ. ئەگـــەر هەر رۆژە و بیســـت و پێنج "ئـــەح"ی بـــە روومدا دا بـــێ دەکاتە.. ناو ســـەرم ئاوسا. بە هەردوو ناولەپی دەستەکانم، توند کونی گوێچکەکانـــم دەگـــرم. دەڵێی لەوە دەترســـێم ناو سەرم بتەقێتەوە و مێشکم لە کونی گوێچکەکانمەوە دەرچێ.

* * *

بەڕێوەبـــەری فەرمانگەکــەم، بێ ئـــەوەی هیچ هۆکارێکـــی هەبـــێ، لە بوونـــم لـــە فەرمانگەکەیدا قەڵس بوو. بەردەوام دەیگوت "تا تۆ لەبەر چاوانم بزر نەبیت من ناحەسێمەوە". دەمگوت بۆ.. مەگەر من خراپەیەکەم لەگەڵ تۆدا کردووە. دەیگوت "نا، بەڵام نازانم بۆ. هەر کە تۆ دەبینم هەســـت دەکەم هێندەی قالۆنچەیەکم لێ دێت".

کوڕەکانـــم دەیانگوت "باوکانی ئەم ســـەردەمە سـێبەریان قورســـە. هەر کـــە دەکەونە مـــاڵ، بۆ ســـەلماندنی هەیمەنـــەی مـــاوە بە ســـەرچوویان، بـــەردەوام پرتـــە و بۆڵەیان دێ، ســـەر بە هەموو کون و قوژبنەکانی ژیانـــی منداڵەکانیاندا دەکەن، چاویـــان وەکـــو کامێـــرای چاودێـــری هەمیشـــە لە سووڕان و چاودێریدایە. ئەو باوکانەش تا بزر نەبن منداڵەکانیان ناحەسێنەوە"...

وەک ژمـــارە ســـفرم لێ هاتبوو. کـــەس، هیچ حســـێبێکی بۆ نەدەکردم. لەوە دەچوو، لە هەموو شـــوێنێک زیادی بم. سەرم لێ دەرنەدەچوو، بۆ وا کـــت و پڕ هەمووان لێم بێزار بـــوون. میترایش لە

هەمـــووی زیاتر. بـــەردەوام دەیگوت "کوا ماوەیەک لەبـــەر چاومـــان بزر بوویتایە. تووشـــی هەناســـە تەنگیت کردووین. دە برۆ بە بێدەنگی لە سووچێک دانیشـــە و ئەوەنـــدە بۆڵەت نەیێ بە ســـەرمانەوە. ئەح"!.

منیـــش، ئەوەنەبـــوو، چـــۆن پەنجـــە بـــە دوگمەیەکەوە دەنێی، ئاوها لە پڕێکدا ون بوومایە. نا، پرۆسەی ونبوونم ماوەیەکی کێشا. ئێوارەیەکیان لە چایخانەی "بەربادەکان" دانیشـــتبووم، یەکێ لە هاوڕێکانم، قەدەرێک تێمڕاما و بە سەرسامییەکەوە گوتی "ئەرێ تۆ لەبەر چاوم کاڵ بوویتەتەوە کاڵ.. دەبێ چاوەکانی من ڕەشکە و پێشکە نەکات"!

منیش ناو لەپی دەســـتێکم بـــە دەم و چاومدا هێنـــا و بـــە کەمێک بێزارییـــەوە گوتم : "بڵێم چی وەڵلا، دەبڵێ ســـیس بوویتە، ڕەنگ و ڕووخسارت هەڵبـــزرکاوە، لاواز بوویتـــە، پێســـتت چرچ و لۆچ بـــووە. چوزانم. بەڵام کاڵ بوویتەتەوە چیە"! ئەمە یەکەم کێچ بوو کەوتە کەوڵم. لە ماڵەوە، ئێوارەکەی هەمانرۆژ تا درەنگانێکی شـــەو، حەیامێک دوور لە

چـاوی میترا، لەبەردەم ئاوێنەکەدا وەسـتام و بە وردی لـە خۆم رامـام، هەندێ نقورچـەم لە دەم و چـاوم گـرت، چـەن شـەپا زللەیەکم لـە خۆم دا، پێسـتی کوڵمەکانم هەندێک زیادیی راکێشـا، دیقەتی ناو چاوەکانی خۆم دا، هیچم بەدی نەکرد.
رۆژی پاشـتر، هاوڕێیەکی دیکەم، هەمان قسـەی هاوڕێکەی دوێنێمـی دووبارە کردەوە. وای لێهات، ژێر پێستم پڕ بوو لە مێروولە. کەوڵم بووە هێلانەی کێـچ. توومەزە، ئەمە سـەرەتای بەرپێواری و بزر بوونم بوو. کەس شتی وای نەبینیبوو. کەس هەر شـتی وای نەبیستبوو. چۆن مرۆڤێک هێدی هێدی کاڵ دەبێتـەوە؟ ئەمـە ناچێتە ناو هیچ زانسـت و لۆژیکێکەوە. سـەیر لەوەدابوو، لە ماڵەوە، هەر لە میتراوە بگرە تا کوڕەکانم و کچەکانم، حاڵەتەکەیان زۆر بە ئاسایی وەرگرت. لەگەڵ ئەوەیدا دڵنیابوون تا ئەمڕۆ، شـتی لەم بابەتەیان بەرگوێ و بەرچاو نەکەوتبوو.
"ئاسـاییە. هـەر مرۆڤێـک هـی زەمـەن و سەردەمێکە. ئێوە، ماوەتان بەسەرچووە"

- جا بۆ هەر من ماوەم بەسەرچووە؟ ئەی ئەو هەموو..

- هی وەک تۆ دەگمەنن. توانای خۆ گرێدان و خۆ بەستنەوەتان نیە بە قۆناغی دوای خۆتان. بە قســەی بازرگانە سیاسەتکارەکانی ئەمڕۆ "تێکەڵ" بە وەزعەکە نابن. بە واتایەکیتر "لێی نازانن" "یان نازانــن بخۆن".. هەر تۆیش نیــت. بەڵام تۆ، هەر ئاگات لە خۆتە.. زۆری وەک تۆ هەن..

- ئەی ئەوانەی لە کاروانەکەی قۆناغی رابردوودا پێکەوە بوویــن. هاوتەمەنەکانــم.. هاووەچەکەم. هاوسەنگە...

- ئەوەتا، تۆ هێشتا لەناو دنیا بە سەرچووەکەی چەمکە سواوەکانی سەردەمی کۆن نوقمی. ئەوانەی تۆ باســیان دەکەی "خۆیان"ی ئەوســایان ناشت. لــەوێ ناشــتیان کە تۆ هێشــتا تێیــدا چەقیوی. بــوون بە "ئەوانیێکیتــر".. خۆیــان وەک تۆ لە ناو چوارچێوەکانی وێنە رەش و سپییەکاندا زیندانیی نەکــرد. ئەوان خۆیــان لەناو قوڕی خەســتی ئەو ئەقڵەی لە مێشــکی تۆدایە عاســێ نەکرد. ئەوان

به سیمای نویّ و، ورگی نویّ و، گیرفانی نویّ و، پۆشاکی نویّ و، خۆراکی نویّ و....

- دەی بیبڕنەوە. ئێوە وەچەیەکی بێ کەڵکن. دەتانەوێ لەسەر داروپەردووی ئێمە خۆتان بنیات بنێـن و دانیـش بـەو بناغەیە دا نانێـن کە ئێمە بنیاتمان نا!

- بناغەی چــی.. ئێوە هەر لە بنەڕەتدا بناغە نەبوون.. دیوارێک بوون هەر نزەبایەک هەڵیکردبایە دەڕووخان و جارێکی دیکە بە هەمان لەرزۆکی قیت دەبوونەوە..

ئەوانە، بەشـێکی کـەم بوون لەو مشـتومڕە هەمیشـەییەی نێـوان مـن و کوڕەکانـم. میترا و کچەکانیشـم تەنها لەوە دەترسان نەوەکا سنووری مشتومڕە دیموکراسییەکەی نێوانمان ببەزێندرێ.

***

دوای ئـەوەی کاڵبوونـەوەم تخووبـی گومانی تێپەڕاندو بووە راستییەکی نکۆڵی لێنەکراو، چوومە لای پزیشک. نازانم پسپۆڕییەکەی لەکام جۆرەکانی نەخۆشـیدا بوو. بەڵام دەمزانی و دڵنیا بووم هیچ

پسـپۆڕییەتییێک بـۆ کاڵبوونـەوە و بەرپێواری و ونبوونی مرۆڤەکان بوونی نیە.

هەموو ئەو جووڵە بێ سوودانەی، پزیشکەکان بۆ پشکنینی هەموو جۆرە نەخۆشەکان، ئەنجامی دەدەن، ئەم پزیشکەیش لەسەر مندا ئەنجامی دا. سـەرێکی بادا. چەند جارێک پێنووسەکەی خستە سـەر کاغەز و دەسـتی هەڵگرت بـێ ئەوەی هیچ بنووسـێ. ماوەیەک بـە بێدەنگییەکی ترسـێنەر تێمڕاما. دواجار ناردمی تا وێنەیەکی تیشکی بگرم. بەڵام کاتێ وێنەکەم گرت و هێنامەوە، پزیشکەکە، تا سنووری شێتبوون حەپەسا. وێنەکە، نایلۆنێکی رەش و رەش بوو. هیچی لێ دەرنەچوبوو. کتێبێکی قەبـەی لابوو. سـەیری هەمـوو لاپەڕەکانی کرد. هەموو جۆرە نەخۆشـییەکانی خوێندەوە. دواجار دیسان هەر سـەری بادا: "سەیرە.. نەخۆشیی وا، لە ئادەمەوە تا ئێستا بوونی نەبووە.لە سەردەمی فیرعەونەکانیشدا هەر نەبووە. لە هیچ سەردەمێکدا نەبووە مرڤێک کاڵ ببێتەوە"..

***

ئەوەبوو لە دەسپێکی ڕۆژێکی خۆشدا و، لە سپێدەیەکی فێنکی نێوان بەهار و هاویندا، لەناو پێخەف هاتمە دەرێ و، وەکو خووی هەمیشەییم چوومە بەر ئاوێنەکە. بەڵام ئاوێنەکە، بە بەتاڵی مایەوە. منی تێدا دەرنەکەوتم. ترسێک سەرتاپامی داگرت. زانیم بۆ هەمیشە بزر بوومە. سەیرێکی ڕۆژژمێرەکەی دیار ئاوێنەکەم کرد. هەموو ژمارە و نووسینەکانی سەری، سڕدرابوونەوە. نەمزانی چەند شەممەیە، نەشمزانی چەندی مانگی چ ساڵێکە. وەکو با بەنێو ژوورەکاندا هاشەم دەهات. هەموو ئاوێنەکانی ژوورەکان و گەرماو و تەنانەت سەیری ناو جامی دەرگا و پەنجەرەکانیشم کرد بەڵکو ئاسەوارێکی کاڵبووەوەش بێ، لە خۆم، ببینم. هیچم لە خۆم بەدی نەکرد. چیدی نەمدەزانی ڕۆژگار چۆن دێت و چۆن دەڕوات. میترا دەیگوت: لەو ڕۆژەوەی تۆ بزر بوویتە نازانین چی بکەین. ئەح!...

کچە هەرە چکۆڵەکەم دەیگوت : دایە. کوا بابە؟

میتــراش دەیگــوت : باوکــت بزر بــووە کچم. چووە بەدوای خۆیدا بگەڕێ.

میترا، منی نەدەبینی، بەڵام هەستی دەکرد لە کوێم. دەیمبینی رووی لەو شوێنە دەکرد، کە منی لێ وەستابووم، دەیگوت :- تۆ بزر بوویتە، کەچی ئێمە لەتۆ وێلانترین. ئەح!

دەیوســـت بڵێ ســـەرگەردانترین. ئـــەوان وەک جاران دەژیان. تەنها ئەوە نەبێ، لە دوای بزربوونی مــن لــە کاتــی ژەمەکانــی خواردنــدا، قاپێــک و کەوچکێک کەمتر لەسەر سفرە دادەنێن. میترایش ئیــدی نازانێ، کە لە دەســـتی منداڵەکانی تورەو پەســـت دەبێ، کاســـە و کۆزەکە لە ســـەری کێدا بشکێنێ و، تورە بوونی خۆی بەسەر کێ دا بەتاڵ بکاتـــەوە. کچـــە هەرە چکۆڵەکەم هـــەر بە دەوری میترادا دەخولایەوە و دەیگوت :- لەوەتەی باوکم بزر بووە پارەی رۆژانەکەم کەمتر بۆتەوە.

میتــراش دەیگــوت : باشـــتر، کـــە بـــزر بوو. مێشـــکمانی کون کردبوو هێندەی بۆڵە و هاوارمان بەسەر دا بکات.. ئەح. !

کەچی لەناوەڕاستی قورگی بەرەو خوار، بە نێو ئەو کەناڵەی کە دەچێتە ناو دڵی ئادەمیزاد، دەنگی خۆی بە جۆرێکی تر دەبیست: خۆزگە هەر لەناومان بوایە .. ڤێرۆسیا لە بۆڵە و هات و هاوارەکانیشی. دڵم بۆی تەنگ بووە. ئەیەڕۆ باشە مرۆڤ چۆن کاڵ دەبێتەوە. ئەو پیاوە چی لێ بەسەرهات؟هەموو جۆری مردنمان بیستبوو ئەم جۆرەیان نەبێ..ئەح.

بەڕێوەبەری پێشووی فەرمانگەکەم لەوەتەی زانیبووی بزر بوومە، لە خۆشییاندا، کەللە قەند لەنێو دڵی دا دەتوێتەوە. بەڵام، لای هاوکارەکانی پێشووم دەم و چاوی تێکدەنێ و دەڵێ : پەکو لەو پیاوە نازدارە. لەو خەباتگێڕە ماندووە. لەو دەستپاک و راستگۆیە. لەو دڵسۆزە. لەو پەپوولەیە. ئاخر چۆن مرۆڤی وا کاڵ دەبێتەوە. پەکو لەو زەمانە سەیر و بێوەفایە.

وەکو رۆحێکی سەرگەردان، کەوتمە گەڕان بە دوای خۆم دا. بەس نەبوو کەس نەمیدەبینی، کەس گوێشی لێم نەدەبوو. وەکو شێت بەردەوام

لەناو شەقامەکاندا دەسووڕامەوە. لە پۆلیسی سەر چوارڕیانێکم پرسی ئاخۆ منی نەدیوە. دەرفەتی نەبوو ئاوڕێکم لێ بداتەوە. یان هەر منی نەبینی و گوێشی لێم نەبوو چیم گوت. کەوابێ ئاوڕی چیم لێ بداتەوە. لە هەر چوارلایدا ئۆتۆمبێلی زۆر راوەستابوون. تا چاو هەڕەتی دەکرد ئۆتۆمبێل راوەستابوو. هەرچی فیکەی لێدەدا سوودی نەبوو. هیچ ئۆتۆمبێلێک لە شوێنی خۆی نەدەجوولا. دەبێ لە پڕێکا هەموو شۆفێرەکان و سەرنشینەکانیش بزر بووبێتن؟ پۆلیسەکە زۆر تورە دیار بوو. ئەوەندە بە توورەیی فیکەی لێدەدا، لە کونی فیکەکەی و هەردوو لالێوی تفێکی کەفاوی جۆگەڵەی بەستبوو. بێ ئەوەی فیکەکە، لە دەمی دەربێنێ گوتی :

– جا من لێرە چیبکەم! وەڵلا هیچ! کە هەموو شۆفێرەکان بزر بووبێتن یاسای هاتوچۆ بە کەڵکی چی دێت. وەڵلا هیچ!

سەرسام بووم. چۆن دەبێ پۆلیسێک فیکە لە دەمی بێ و ئەو هەموو قسەیەش بکات! کەوتە ناو مێشکم "دەبێ من مردبم"؟ چوومە نێو گۆڕستانە

گەورەکەی قەراخی شار، بەسەر گۆڕەکان و لاشەی خەوتووی مردووەکاندا بازبازانێم بوو. دەتگوت ئیزراییل سەری ناوەتە دوام و منیش لێی هەڵدێم. لە ترسا ئارەقەی شین و مۆرم لێ دەچۆڕا. بەڵام تنۆکێکیش نەدەکەوتە سەر زەوی.

لەسەر ئەو گۆڕانەی تازەتر بوون رادەوەستام. چوومە بەشی ئەوانەی لە پێناوێکدا مردبوون. گڵکۆ شکۆمەندەکانیانم بەسەر کردەوە، کێڵی گۆڕەکانیانم لاپەڕە لاپەڕە هەڵدەدایەوە، هەموو ناوەکانی سەر کێڵەکانم خوێندەوە. زۆربەیانم دەناسی. هاوسەنگەربووین. چەندێکیانم دەزانی لە کام شەڕ و لە چ بەروارێکدا گیانیان بەخشیبوو. ناوم بەسەر هیچ کێڵێکەوە نەبوو. کەوابێ نەمردووم. ئەی کە نەمردووم بۆ لەناو زیندوواندا نیم. ئایا دەکرێ ئادەمیزادێک نە زیندوو بێت و نە مردوو. گەڕامەوە ماڵەوە.

میترا، هەردوو ئەژنۆی لە ئامێز گرتبوو. فرمێسکی دەباراند و بەدەم هەنسکدانەوە رووی لە منداڵەکانی کردبوو، دەیگوت "دەبێ ئەم کابرایە چی

بەسەر هاتبێ؟ دەبێ سەری خۆی، لەدەست پرتە و بۆڵەکانی من و لە دەســت قســە زلەکانی ئێوە، بەرەو کوێ هەڵگرتبێ؟ ئاخۆ ئێستا لەنێو تونێل و پێچ و کۆڵانەکانی کام مێژوودا وێلانە؟ دەبێ ئێستا لەنێو لاپەڕەکانی کتێبی کام رابردوو بەدوای خۆی دا بگــەڕێ؟ دەبێ خــۆی دۆزیبێتەوە و بگەڕێتەوە ناومان؟ چاومان بە دەرگاوە وشک هەڵگەڕا کەچی هــەر نەهاتەوە. ئەی ئێوە بۆ هەڵناســتن بچن بە دوای دا بگەڕێــن. ئێــوە وەچەیەکــی بێ ئەمەکن. بێشــک بن بە نەبوونــی ئەو، هەمــوو رێگاکانتان لــێ تێک دەچــێ و دەکەونــە لاڕێ. دەبوایە رێگە لــە کاڵبوونــەوەی بگرن. لە جیاتی قســەی زل و دڵئێشاندنی، دەبوایە چارەیەکتان بۆی بدیتبایەوە. نەدەبوایــە لــێ بگەڕێــن باوکتــان کاڵ ببێتــەوە. گوناحە. ئەوەتــا ون بووە. لەو رۆژەوە هەموومان دەڵێی سەربە جەســتەمانەوە نیە. نەدەزانین بیر بکەینــەوە.. نەدەزانین ورتەیەکمــان لێوە بێ. نە شــتێک دەبینیــن.. نــە دەنگێک دەبیســتین. نە ئەقڵمان بە هیچدا دەشکێ.. بۆ ناچن لەو شوێنانەدا

بەدوایدا بگەڕێن کە لەوانەیە بۆ ئەوێ چووبێ"...
کوڕە گەورەکەم گوتی "چووم.. گڵکۆی هەموو گیانبەخشـەکانم بەسەر کردەوە. ناوی ئەو بەسەر هیچ کێڵێکەوە نەبوو.
کـوڕە ناوەنجییەکـەم گوتی "منیـش چوومە بینینی ئەو پێشـانگایەی بۆ رۆڵـە قارەمانەکانی وڵات رێـک خرابـوو. هەزاران وێنە هەڵواسـرابوو، کەچی زۆرێک لـە چوارچێوەکان هیچ وێنەیەکیان تێدا نەبوو. تەنیا لەسـەریان نووسرابوو گیانبازی ون... گوتم رەنگە باوکیشم یەکێک بێ لەوانە ...
کوڕە گچکەترەکەم گوتی" منیش چوومە هەموو ئەو سەنگەرانەی باوکم ناونیشانەکانی دابوو پێمان و، لـە نێویاندا شـەڕی بەناوبانـگ کرابوو. کەچی هەموو ئەو شوێنسـەنگەرانە کرابـوون بە تەلار و ڤیلاو، دەوریان تەلبەند کرابوو. پاسـەوانەکان لێ نەگـەڕان بچمە نێـو تەلبەندەکانـەوە بزانم باوکم لەوێیە یان نا، پاڵێکیشیان پێوەنام....
کچەکەم گوتی "کێ دەڵێ باوکم بزر بووە.. کێ ناڵێ ئێمە بزر بووینە و ئێستا ئەو بەدوای ئێمەدا

دەگەڕێ".

میترا بە سەرسوڕمانێکەوە گوتی "ئەیەڕۆ. تۆ بڵێی"؟!

❊❊❊

لە حەژمەتی کارەساتەکەدا، لە ماڵ دەرچووم و، وەکو شـێت کەوتمە ناو شـەقام و کۆڵانەکانی شـار. بـێ ئەوەی هیچ کەس و هیـچ دیوار و هیچ ئاستەنگێک ببێتە کۆسپ و لەمپەر لەسەر ڕێگامدا، بەنێـو جەنجاڵی شـاردا هەڵدەهاتـم، . نەمدەزانی لـە چـی و بەرەو کـوێ هەڵدێم. هـەر دەگریام و هـاوارم دەکـرد کـەس نەیدەبینیـم و کەسـیش هاوارەکانـی نەدەبیسـتم. وەکو سـێبەرێکی کاڵ و سـەرگەردان، دەتگـوت لە هەتـاو هەڵدێم تا بە یەکجاری نەسرڕدرێمەوە. کاتێک شەکەت و ماندوو، لـە هەورازاییەکی قەراخی شـار گلۆر بوومەوە ناو خەرەندێکـی تاریـک و بۆگـەن. لـەوێ خەوم لێ کـەوت. سـەروەختێ لەتاو سـەرما و بۆگەنی، بە ئازارێکی توندی ناو سەرم واگا هاتمەوە.

هەمــوو نــاو خەرەندەکە پڕ بوو لــەو کاغەز و لافیتانەی دروشمێکی زۆریان بەسەرەوە بوو. خۆم لەنێویاندا لوول دا و ویســتم خەوم لێ بکەوێتەوە بەڵام سوودی نەبوو.

کەوتمەوە ســەر رێــگای گەڕانەوە بــەرەو ناو شــار. رێگەم کەوتە ناو پارکی مێژوو. هاوسەنگی خۆم لە دەســت دابوو. لەترســی ئەو پۆلیسانەی چاوەچاوەیــان بوو، مەســتێکی درەنگانی شــەو، یــان تەنانەت ســێبەرێکی کاڵبــووەوەی وەک من بکەوێتــە داویان و ئەرکی شــەویان پــێ بە کۆتا بهێنــن، لە بەردەم پێیــە کۆنکریتییەکانی کۆتەڵە زەبەلاحەکــەی گیانبازی ون، کە رووخســاری کت و مــت لەمــن دەچوو، دارمــام و کەوتمە خەوێکی هێنــدە قووڵ، بــڕوام وایە تا رۆژی هەســتانەوەی یەکجارەکی، حەزم بە واگا هاتنەوە نەبێ.